

# دیوانا مەلا عەلی کەشانی

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن
د. فاخر حەسەن گولی

# دیوانا

# مەلا عەلی کەشانی

## مەلا عەلی تەتەرخان عەبدوڵڵەتیف

## ١٩٤٠-٢٠٢٠

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>مەلا عەلی کەشانی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین | دیـــار عـبـدالله |
| بەرگ | جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-9168-4-2 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٥٥ / ٢١ |




Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

# پێشەكی

هەلبەستڤان (مەلا عەلی كەشانی) ئێكە ژ ئەوان هەلبەستڤانان ئەوێن مینا گەلەك هەلبەستڤانێن كورد هەر ژ دەستپێكا زارۆكینیا خوە هەتا گەنجاتیێ ژیانەكا پڕی نەخوەشی و زەحمەت بووراندبوو، ڕەنگە هەر ئەڤێ چەندێ ئەو بەرەڤ ڤەهاندنا هەلبەستان پالدابیت. د ئەڤێ پێشەكیێدا هەوڵ هاتیەدان ب شێوەیەكێ ڕێكوپێك باسێ ژیاننامەیا هەلبەستڤانی ژلایێ جڤاكی، ڕەوشەنبیری و سیاسی و ل داویێ ئاماژە ب گرنگترین تیبینیێن ئەڤێ دیوانێ بهێتەكرن.

## هەلبەستڤان ژلایێ جڤاكییە:

(مەلا عەلی تەتەرخان عەبدوڵڵەتیف) ناڤدار ب (مەلا عەلی كەشانی)، د بنیاتدا خەلكێ گوندێ (سەرانگێله) سەر ب دەڤەرا (دۆسكی ژووری)ڤە. بابێ وی د ژیێ گەنجاتییێدا بەرەڤ گوندێ (بیركیاتێ) دەڤەرا (بەرواری ژێریان)ڤە چوو و ئاكنجیبوو. هەر ل وێرێ خێزان پێكهینابوو. مەلا عەلی ل سالا (١٩٤٠)ێ ل وێرێ ژدایكبوو. هەلبەستڤان د دەستپێكا گەنجاتیا خوەدا چوو گوندێ (كەشان)ێ سەر ب دەڤەرا گولیانڤە، ل وێرێ تێكهەلی بنەمالا (عەلیكێ) بوو، هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ ب (مەلا عەلی كەشانی) ناڤدار بوو. و ژیانا هەڤژینیێ ل گەل خانم (سەمیا ئەحمەد نیعمەت كەشانی) كو ژ بنەمالا ناڤبری بوو پێكهێنا، خودایێ مەزن شەش كەچ (بەسنا، مریم، زولەیخا، شەمسی خان، دلبەر و فاتیما) ب ئەوان بەخشی. ناڤهاتی ل ڕێككەڤتی (٢٠٢٠/٢/٩)ێ، ل باتیفا بۆ هەتاهەتایی ژ ئەڤێ جیهانێ مالئاڤایی كر.

**هەلبەستڤان ژلایێ زانستیڤە:**

(مەلا عەلی) د ژیێ هەشت سالێیێدا دەست ب خواندن و فێربوونا قورئانا پیرۆز کر، هێشتا د ژیێ زارۆکینییێدا بوو، دایك و بابێن ئەوی مالئاڤایی کرن، پشتی ئەڤێ چەندێ ل نك مامێ خوە (عوسمان)ی مابوو لێ یا دیار ژبەر چەندین هوکاران نەشیابوو ل وێری بمینیت. لەورا بۆ ماوێ چەندین سالان واتە هەتا سالا (١٩٥٨)ێ، ب مەرەما فەقیاتیێ و بدەستڤەهینانا زانستێن ئایینی ژ ئەڤی گوندی چوویە گوندەکێ دیتر ژ ئەوان: (بیرکیات، شکێران و باسڤرە) سەر ب قەزا ئاکرێڤە، (گوندێ قابوسی و کوندوڤی) دەڤەرا شنگالێ، (گوندێ دۆلا) سەر ب قەزا زاخۆڤە، هەژی گۆتنێیە مفایەکی باش ژ وانەیێن (مەلا نۆرەدین سندی) ل گوندێ (بێشیلکی) سەر ب دەڤەرا سندیانڤە وەرگرتبوو. ئەوا ژ دەستی ئەوی هاتی کێماسی د فێربوونا زانستێن ئایینیدا نەکر و بەردەوام ل دویڤ دچوو و هەتا ئاستەکی شیا ببیتە کەسەکێ ئایینی و ب (مەلا عەلی کەشانی) ناڤدار بوو. ل سالا (١٩٥٩)ێ، چوو بوو (موعەسکەر غەزالان) ل مویسل وەك پێشنڤێژێ دەمکی بۆ پێنج هەیڤان ل وێرێ مابوو. ئێك ژ بەرهەمێن ئەوی یێن خواندنا ئایینی ب دەهان بەلکو ب سەدان کەس (قورئانا پیرۆز) ل دەڤ ئەوی ب داوی هێنابوون.

**هەلبەستڤان ژلایێ سیاسیڤە:**

(مەلا عەلی) ل سالا (١٩٥٨)ێ پەیوەندی ب رێکخستیێن پارتی دیموکرانی کوردستان کر و دگەل سیاسەتمەدار (سالح یووسفی) دابوو. هەلبەستڤان د مالکەکا هەلبەستا خوە یا ب ناڤێ (دیرۆکا ژین و خەباتا من) دا دبێژیت:

وەك چیایەكێ من یێ خۆ ڕاگرتی

ل پێنجی و هەشتێ ئەز بوومە پارتی

ل دواییا ساڵا (١٩٥٩)ێ، ناڤێ خوە ل بنگەهێ پەڕەشووتڤانییێ تۆمارکر و هاتە قەبویلکرن، هەر ب ئەڤێ مەرەمێ ژبۆ پشکداریکرن د خۆلا خوە هاڤێتنێدا ب پەڕەشووتێ ژ فرۆکێ بەرەڤ بەغداڤە چوو، پشتی هەڤدە جاران خوە هاڤێتن ژ فرۆکێ ل (موعەسکەر ئەلڕەشید) ل باژێرێ بەغدا. ناڤبری پشتی ماوەیەکی ل گەل هەر دوو هەڤالێن خوە (ڕەمەزان مەعروف دۆسکی و عەلی مستەفا بێدوهی) چوونە سەرەدانا (مەلا مستەفا بارزانی) و ژ ئەوان پرسی کارێ هەوە د ناڤ لەشکەریدا چییە، ئەوان ژی گۆت کاری مە خوە هاڤێتن ب پەڕەشووتێ ژ فرۆکێ یە، دبێژن: کەیفا ئەوی گەلەك ب ئەڤی کاری هات و گوتە ئەوان دێ ڕۆژەك هێت کورد دێ پێدڤی کەسانێن مینا هەوە بن.

پشتی شۆڕەشا ئەیلولی ب ڕێبەریا (مەلا مستەفا بارزانی) ل ڕێککەڤتی (١١) ئەیلولێ ساڵا (١٩٦١)ێ دەستپێکری، (مەلا عەلی) د هەمان ساڵدا ل ڕێککەڤتی (٢) چرییا ئێکێ پەیوەندی ب شۆڕەشا ناڤبری کر و خوە گەهاندە گوندێ (زۆراڤا و قاسمێ نەسێ) ل دەڤ (مەلا نورەدینێ سندی) و گەلەك جاران هاتن و چوونا بارەگایێ بارزانی ژبۆ دیتنا سەرکردە (ئەسعەد خۆشەوی) دکر. مەلا عەلی د مالکەکا هەلبەستا خوە یا ب ناڤێ (دیرۆکا ژین و خەباتا من)دا دبێژیت:

ژ هزار و نەهـ سەد و شێست و ئێکێ
پێشمەرگەمە و هەر ل سەر ڤێ ڕێکێ

ئەز ببووم پێشمەرگە ژبوونا ئاخێ
من نەڤیا ژینا بندەستی کەمباخێ

ناڤبری وەك كادرەكێ چەلەنگ ل دەڤەرا زاخۆ مابوو و تفەنگ وەرگرتبوو، پێشمەرگایەتی ل گەل (حەجی موحەممەد تاهر بەهنینەی، عەلی هالۆ بۆسەڵی، فەرحان عەبدوڵلا كەشانی و عەلی عەلی) كربوو. هەژی گۆتنێیە كو بەردەوام ل گەل هێزا زاخۆ دابوو هەتا شۆڕەشا ناڤبری ب داوی هاتی. (مەلا عەلی) ب درێژاهیا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێ پشكداری د دەهان شەڕان دا كربوو وەك شەڕێن باتیفا (١٩٦٢)ێ، مەتینی (١٩٦٣)ێ و... هتد. ب كورتی ئێك خۆلەكێ ژی خەمساری د خزمەتكرنێدا نەكربوو و ئەوا ژ دەستی ئەوی هاتی ژبۆ بەرەڤانیكرنا ئاخ و وەڵاتی خوە كر.

هەر ئێكسەر پشتی شۆەشا ئەیلولی ب داوی هاتی، وەك گەلەك كوردێن دیتر بۆ دەڤەرا (دیوانیە) باشوورێ عێراقێ هاتە دویركرن، لێ پشتی شۆڕەشا (گولانێ) ل ساڵا (١٩٧٦)ێ دەستپێكری، ناڤبری ل ڕێككەڤتی (٣٠) ئەیلوولی ساڵا (١٩٧٦)ێ ئێكسەر پەیوندی ب شۆڕەشا ناڤبری كر و وەك كادرەكێ (كارگیری و عەسكەری و گومركی) دەستبكاربوو. ل داوییا ساڵا (١٩٧٦)ێ چوو باكوورێ كوردستانێ و هەتا ساڵا (١٩٨٤)ێ ل وێرێ مابوو و پاشی خوە گەهاندە ڕۆژهەلاتێ كوردستانێ (ئیران) ل ڕاژان ئاكنجیبوو. پشكداری د چەندین كریارێن لەشكەریدا كربوو ژ ئەوان: داستانا ناڤدار (خواكورك) ساڵا (١٩٨٨)ێ. هەلبەستڤان د مالكەكا هەلبەستا خوە یا ب ناڤێ (دیرۆكا ژین و خەباتا من)دا دبێژیت:

مـــن خـــۆ ســـپارتە كوردســـتانا بـــاكوور
ژ خزمـــــەتـــــا وەڵات نـــــەچـــــووم دوور

چـــەوا پـــەیـــدا بـــوو شـــوڕەشـــا گـــولانێ
ئـــەز بـــووم پێشـــمەرگـــە و هـــاتم مـــەیـــدانێ

پشتی سەرهلدانا بهارا ساڵا (١٩٩١)ێ و ئازادبوونا باشوورێ کوردستانێ، ڤەگەڕیاڤە وەلاتی و ل باژێڕۆکێ (باتیفا) سەر ب دەڤەرا (گولیان)ڤە ئاکنجی بوو، و هەتا مالئاڤاییێ پێخەمەت گەل و نیشتیمانی بەردەوام د خەباتا دابوو.

## چەند تیبینیێن گرنگ ل سەر دیوانێ:

ئەڤ دیوانا یا پڕە ژ تیبینیان و ل ڤێرێ هەوڵ هاتیەدان ئاماژە ب گرنگترینی ئەوان بهێتە دان و ب ئەڤێ شێوەیێ ل خوارێنە:

- ئەڤ دیوانە ژ (٢٣٦) هەلبەستێن (جڤاکی، نیشتیمانی، ئایینی و سیاسی) پێکهاتیە.
- هەلبەستڤانی چەندین ناڤ و ناسناڤ د ئەڤێ دیوانێدا ژبۆ خوە ب کارهینانە (عەلی، مەلا عەلی، ڕیاد، مەلا عەلی کەشانی، عەلیێ بەسێ، عەلی تەتەرخان، کوڕێ تەتەرخانی، عەلیێ کوردستانێ، لێ هەژی گۆتنێیە کو (عەلی، ڕیاد) ژ هەمیان پتر هاتینە دووبارەکرن.
- مەلا عەلی سەبارەت هەلبەست ڤەهاندنا خوە چەندین پەیڤ بکارهینیانە وەك: عەلی بگرە قەلەمی، بنڤیسیە، گۆتنێت تە بارۆتە و موکومە وەك کەڤری، تە ب پێنووسێ خوە کوردستان ڕۆهنکر و... هتد. ل د چەند مالکێن هەلبەستا ب ناڤێ (ماینە ساڤا)دا دبێژیت:

عەلی تو بگرە ئەڤی قەلەمی
تو بنڤێسە دیرۆکا ڤی دەمی
بۆ چاڤێت دوژمنا تیژکە قەلەمی
ل سەر خاترا کورد و کوردستانێ

ل جهەکێ دیتر هاتیە:

عـەلـی تـە قـەلـەم کـر بـارۆت
تـــە دلـــێ دوژنـــا ســـۆت
تـــە پێنوســـێ خـــۆ کـــر بـــزۆت
تـــە رۆنکـــــر کوردســـــتانە

- پرانیا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ (رۆژ و هەیف و سالْ) و جهێ ڤەهاندێ هاتینە دیارکرن و هەر ل دویڤ ئەڤێ چەندێ هاتیە رێکخستن، لێ هەژی گۆتنێیە کو هندەك ژ ئەوان بێ مێژوو و جهێ نڤیسینێنە و مە هەولْدایە جهێ ئەوان ل دویماهییا دیوانێ بکەین، داکو تێکەلی هەلبەستێن دیتر نەبن و ل پەراوێزا هەر ئێك ژ ئەوان، هەڤۆکا (مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین) بکارهینایە. هەروەسا هژمارەکا دیتر یا هۆزانان نە خوەدی ناڤونیشانن و هەر ب ئەڤێ مەبەستێ هەولْ هاتیەدان دێرا ئێکێ یا هەر هەلبەستەکێ وەك ناڤونیشان بهێتە دەستنیشانکرن و ب ئەڤێ رستەیێ (ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن) ل پەراوێزان هاتیە رۆهنکرن.

- ب هیچ رەنگەکی مە دەستکاریا رێنڤیسا هۆزانڤانی نەکریە، ب تنێ د ئەوان پەیڤاندا کو ب شاشیا رێنڤیسی دهێنە هژمارتن و کارتێکرنێ ل ریتم و واتایا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتیێ ئەوێ ناکەت، راستڤەکرن هاتینە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چو- چوو)، (بو- بوو)، (بو- بۆ) و... هتد.

- هەولْ هاتیەدان هەر پەیڤەکا نەرۆهن یان پەیڤێن پێدڤی ب پێناسەکرنێ د دیوانێدا، ب شێوەیەکێ رێکوپێك ل پەراوێزان هاتینە نڤیسین.

ـ (مەلا عەلی) خوە وەك مرید، شاگرد و قوتابیێ هەلبەستڤانێ مەزن (مەلا ئەحمەدێ نالبەند) ددەتە نیاسین، و ئەوی وەك رێنیشاندەرێ خوە ل قەلەم ددەت، هەر کەسەکێ ل دیوانا ناڤبری روینشتبا ل شوینا هەلبەستێن خوە دا دەست ب خواندنا هەلبەستێن (نالبەند)ی کەت، واتە کێمتر هەلبەستێن خوە دگۆتن. هەلبەستڤان د هەلبەستەکا خوەدا یا ب ناڤێ "نالبەند رەوشەنیر بوو" و د دەستپێکا هەلبەستێ دا دبێژیت:

ب راســتی نالبــەنــد رەوشــەنبیــر بــوو
بــۆ هـــۆزانێ ســـولتان و میـــر بـــوو
ژبـــۆ خـــانی ئـــەو جێگـــر بـــوو
بـــۆ دنیـــایێ یـــێ مـــاهر بـــوو

ـ (مەلا عەلی) ب درێژاهیا دیوانی چەندین هەلبەستێن ئایینی ڤەهاندینە و ەك: "ئەو چێکەرێ ئەم چێکرین"، "بەحشت یا خۆشە"، "ئەڤە رەمەزان هات"، "ئەی موسلمان ڤێت خۆ بناسی"، "یا ئیلاهی ئەلعالەمین"، "چێکەرێ ئەرد و عەسمانا"، "دنیا ملکێ خودێیە" و... هتد.

ـ کوردستان ل دەڤ (مەلا عەلی) واتایا بەهشت، ڤیان، دایك، ئاخ، وەڵات، دل حەبین... هتد ددەت، ناڤبری چەندین هەلبەستێن خوە ب پەیڤا کوردستان ناڤکرینە و پێکهاتینە ژ: "کوردستانا زەنگین"، "کوردستانا من"، "کوردستانا میر و پاشا"، "کوردستانە بویکا جیهانێ"، "بۆ کوردستان خۆ کر فیدا"، "(سبحان الله) کوردستان چ خۆشە"، "کوردستان کەربەلایە"، "رۆژا ل کوردستانێ هەلاتی"، "کوردستان من حەش تە کر"، "من نەڤێت کوردستان بێ کەو"، "تە پیرۆز بیت کوردستان"، "کوردستان خۆشەویستە"، "چەند دار هەنە ل کوردستانێ"، "ئەی کوردێ کوردستان"، "بژیت کورد بژین کوردستان" و "بۆ کوردستانێ"، ژبلی ب دەهان ناڤونیشانێن کو

گرێدانه ب ناڤێ كوردستان هاتینه، هەلبەستڤان د چەند مالكێن هەلبەستا ب ناڤێ "كوردستان خۆشەویسته" دبێژیت:

كوردســـــــتان خۆشـــــــەویســـــــته
پاراســـــــتنا وێ یـــــا پێویســـــــته
كوردســـتان ئێكــه نــەچــار قســـته
هێـــژ یـــا ل بنـــدەســـتا ڤـــەرِســـته

ـ ئازادیا و رزگاربوونا مللەتی كورد ژ بەرهەمێ خوینا شەهیدانه، لەورا هەلبەستڤانی حەفت هەلبەستێن خوە ب ناڤێ شەهیدان ڤەهاندیه و پێكهاتینه ژ: "پەیمان بت دەیكێت شەهیدا"، "شەهیدێن مە"، "خوینا شەهیدا ل سەر ئاخێ مەهی"، "جهێ شەهیدێن كوردانه"، "خوینا شەهیدانه ئەرزانه"، "شەهیدێ زیندی" و "بارزانی تو شەهیدەك نەمری". هەروەسا دەهان مالكێن جودا جودا یێن ئەڤێ دیوانێ ل سەر شەهیدان هاتینە ڤەهاندن. د هەلبەستا "پەیمان بت دەیكێت شەهیدا" سەبارەتێ شەهیدان ب ئەڤی شیوەیی دبێژیت:

شـــەهیـــد شـــەمالـــه نـــاڤ شـــاخ و داخـــا
دەرمانـــــــه ژبـــــۆ ســـــاخ و نـــــەســـــاخا
رۆناهیـــــــا وان دا كـــــــولان و تاخـــــــا
وان بـــــــەرهـــــــەم زۆره وەكـــــــی مشـــــــتاخا

ـ چونكه (مەلا عەلی) تەڤایا ژینێ خوە د پێشمەرگایەتیێدا دەرباز كربوو، لەورا پێشمەرگه د فەرهەنگا ویدا وەك جانفیدا، زەحمەتكێش، زێرەڤان، دوژمن بەزین، شێرێن مەیدانێ و... هتد. و شەش هەلبەست ب ناڤێ پێشمەرگه ڤەهاندینه و پێكهاتینه ژ: "ئەز پێشمەرگێ كوردانم"، "پێشمەرگێ هۆ نینه كەسێ"، "پێشمەرگه"، "پێشمەرگه لەیلا قاسم"،

"پێشمەرگە مەغدۆرە" و "ئەز پێشمەرگێ کوردانم" ئەڤە ژبلی هەلبەستێن کو پڕانیا ناڤەڕۆکێن ئەوان باسێ پێشمەرگەی کری. د چەند مالکێن هەلبەستا ب ناڤونیشانێ "ئەز پێشمەرگێ کوردانم" دبێژیت:

ئـــەز پێشـــمەرگـــێ کـــوردانم
بـــۆ خـــاکێ بـــەرەڤـــانم
ئـــەز مـــافێ خـــۆ دزانـــم
ئـــەز کـــوڕێ کوردســـــتانم

ـ (مەلا عەلی) د هەلبەستێن خودا گەلەك دژی ئاغایە و ان وەك کەسانێن نە دلسۆز بۆ گەل و وەلاتی ل قەلەم ددەت، د هەلبەستا ب ناڤێ "ئاغایێ زگ گامێش" دبێژیت:

ئـەگـەر مـەسئوول ئاغا بیت
کـارێ مـە دێ بـەلا بیـت
کوردســـتان ئاڤـــا نابیـــت
تـــا کـــەنگـــی دەر ب دەری

ـ هەلبەستڤان د هندەك جهێن ئەڤێ دیوانێدا، گازندەیان ژ کار و کریارێن هندەك بەرپرسێن نە ژ هەژی بەرپرسایەتیێ دکەت و د بێژیت:

نـە هـەژی بوونـە ئـەزبـەنـی
بوونـە سـەیـدا و بوونـە ڕێـزدار

ـ دەمێ مرۆڤ هەلبەستێن (مەلا عەلی) دخوینیت ب تایبەتی یێن داوییا ژیێ ئەوی، جۆرەکێ بێ ئۆمێدیێ ژ وێ گرنگی نەدان ب خزمەتا چەندین سالییا ئەوی پەیدابببوو. د چەند مالکان دبێژیت:

ئـــەز بوومـــە پـــالێ پیشـــی
ڕادامـــــە نـــــاڤ گلیشـــــی

گـــۆت تـــو نابيـــه پيشـــى

قـەبـوول نـابى ل حوكمـەتـێ

ل داويێ دبێژين: سوپاسيا خودايێ مەزن و دلۆڤان دكەين، هەروەسا سوپاسيا مالباتا هەلبەستڤان (مەلا عەلى) و هێژايان (نزار مەجيد نزورى و على خالد كەشانى) و تەڤايا كەسانێن بووينە هاريكار و پشتەڤان دكەين.
هيڤيدارين ئەڤ كارە ببيتە بەرهەمەك گشت تورەڤان و خواندەڤان مفايى ژێ وەربگرن.

د. فاخر حەسەن گولى

دهۆك ٢٠٢١

# ڕێناسی[1]

چ بێژم بۆ تە بارزانی[2]
تو هەر ئالا مە کوردانی
تو ڕێناسێ مە هەمیانی
تو ژ مەڕا وەکی خانی

تو ناڤی بۆ هەمی کوردا
تە ناڤ گێرا ل خڕ عەردا
تە دەستێ خۆ ژێ نە بەردا
تا نە مر ل سەردانی

ژیایی ب سەربلندی
تە بوون هەڤال ژار و گوندی
تو تم[3] ساخی و هەر زیندی
بۆ مە کوردا تو لوقمانی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی - ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(٢) مەلا مستەفا بارزانی ل (١٤ ئادارا ١٩٠٣)ێ، ل گوندێ بارزان هاتیە سەر دونیایێ ب ناڤدارترین و مەزنترین ڕێبەرێ تەڤگەرا ئازادیخوازا کورد دهێتە هژمارتن، گرنگترین خال د ژیانا بارزانیدا چوون و زڤڕینا ئەوی ژ ڕووسیا (١٩٤٦-١٩٥٨)ێ، و ڕێبەریا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١- ١٩٧٥)ێ بوو، ل سالا (١٩٧٩)ێ، مالئاڤایی کر.

(٣) (تم) واتە (هەردەم).

ڕێكا تە ڕێكەكا ڕاستە
تە خاترا خۆ ژ مە خواستە
تە فوكرا خۆ نە گوهاستە
وەك زۆرا ل ڤی زەمانی

تو بوویی بۆ مە موعەللم
تو بوویی قایدێ مولهم[1]
خۆزی ل مە كربا حوكم
دا چووبانە ڕێزا ئینسانی



[1] سەركردێ پەهلەوان.

# شەڕێ[1] مەتینی[2]

پسیارکە ژ مەتینی
کا چەند ناپال لێدانە
دێ کەت بەحسێ دوژمنی
گەل لەشکەرێ کوردانە

چەند گرک و چەند چالک
هەمی دێ بنە شاهد
چەند لێ بوویە جنگ و دنگ
وەکی ئاخر زەمانە

ل سالا شێست و سێدا
پێشمەرگە بووم ل وێرێ
مە و دوژمنی لێکدا
مە کر شەڕەک گرانە

مودێ[3] چل و پێنج ڕۆژا
ئەوی شەڕی ڤەکێشا
ل نزار و بەرۆژا
بوویە تۆز و دومانە

---

(١) شەڕێ مەتینی، ل سالا (١٩٦٣) دناڤبەرا هێزێن پێشمەرگەی و لەشکەرێ عیراقێدا ڕویدابوو.

(٢) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(٣) دەم، ماوە.

بو قەبقەبا پێشمەرگا
دەنگێ وان چوو عەسمانا
وەك شێرا وەك پلنگا
هێرش ل دوژمن دانە

دوژمن ب تەڤ سیلەحی
هاتە قاد و مەیدانی
بلا نەبت مەدحەیی
زۆر ژێ كەتن دەستانە

خۆسارەتا مە كیم بوو
ل گورا ئەوی شەڕی
نك دوژمنی بەیان بوو
خۆسارەتی بۆ وانە

ل ڕۆژا چل و پێنجێ
كارێ خۆ كر و ڕەڤی
پییێت وان گرتن ڕێنجێ
تشت هێلان بێ خودانە

دوو مەدفەعێت[١] جەبەلی[٢]
كەتن ددەستێ مەدا
ژ غەیری كەل و پەلی
هێلا بوون بێ خودانە

مە لێدان سهـ شەهید
دگەل سهـ بریندارا
دا تو بزانی عەگیدا
مەتین دیرۆكا وانە

---

(١) تۆپ.

(٢) چیایی.

## ئاخ مشەختی[١]

ئاخ مشەختی چەند نەخۆشە
هاتن سەر مە زۆر قەرقەشە
من دل قورمچی مە نەگەشە
ل ناڤ وەلاتێت بیانی

هەرۆ ژاری و دەستکورتی
جلکێ دڕیایی و پەڕتی
دوژمنێ ل مە کر خۆرتی
ئەم دەرێخستین ژ خانی

ئەم ژ وەلاتی چووینە دەر
ئەم زۆر بووین بێ سەروبەر
هەمی مایینە بێ مەفەر
ئیللا هیڤیا ڕەحمانی

بێ خانی و بێ ئاڤاهی
ل بەر ستێرا و ساهی
هیڤیا خودێ و ئیلاهی
سەر عەردی و بن عەسمانی

ئەم هەرۆ وەك بەگزادا
بۆ هزار گوندا مە لادا
دەرێ تویری مە بادا
بۆ مە نەما مێرانی



---

[١] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

نکارم گەلەك درێژ کەم
سەرێ حازرا پێ گێژ کەم
ئەگەر ئەز دا بەحسی هێژ کەم
دا دوماهیێ بزانی

ئەز پێشمەرگەمە مشەختی
ناکەم چ جارا بێ بەختی
بلانێ نەچم سەر تەختی
هەر ئەزم عەلی کەشانی[1]

[1] کەشان، گوندەکە سەر ب دەڤەرا (گولیان)ڤەیە.

## پەیمان بت بۆ وە دەیکێت شەهیدا [1]

پەیمان بت بۆ وە دەیکێت شەهیدا
هندی ئەم ساخ بین د ڤی جهیدا
شەهید نقیسینە نیڤا دلیدا
ڕۆناهینە د شەڤا تاریدا

شەهید شەماڵە ناڤ شاخ و داخا
دەرمانە ژبۆ ساخ و نەساخا
ڕۆناهیا وان دا کولان و تاخا
وان بەرهەم زۆرە وەکی مشتاخا

هەر دەیکێت وانن شانا سەرەکی
چ کەسێ ژ وان بدەت کورەکی
مەپ دوژمنا نابت چ پاکی
نابت جهێ وان سەری (کورەکی)[2]

دەیکێت شەهیدا قەت نەخۆن خەمێ
ڤێ خەباتێ دێ دەوامێ دەمێ
سەر و ماڵ دێ قوربان کەم هەمێ
دا ئازاد بین خلاس بین ژ خەمێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل ساڵا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] چیایێ کورەك سەر ب قەزا (سۆران) — پارێزگەها هەولێرێڤەیە.

شـيرێ وان خـوارى بـۆ وان حـەلال بيـت
ئـو خـەباتـا وان بـۆ مـە مـەتـاڵ بيـت
ئـالايێ مللـەتـى دێ بـۆ وان بلنـد بيـت
جهێ وان ل بەهشتێ خۆش و فرەهـ بيـت

خوينـــا هـــەوە بـــۆ حـــوبرێ تـــاريخێ
ئـو دێ كـەڤيـت سـەر پـەرێ مـەريخـێ
ناڤێـت دەيكـا وەك حـەلـێ و زەليخـێ
ژێ ناچـت ب چـەقـوكێ ب تيخـێ[1]

[1] دەڤەك.

# ئەز پێشمەرگێ کوردانم[1]

ئەز پێشمەرگێ کوردانم
بۆ خاکێ بەرەڤانم
ئەز مافێ خۆ دزانم
ئەز کورێ کوردستانم

باب و باپیرێت من
هەمی تێدا ژیانە
ئەوان هێلایە بۆ من
ئەڤرۆ ئەژی[2] خودانم

کوردستان خاکا منە
کەسێ حەق تێدا نینە
ما دوژمنا چ ژ منە
ئەز دێ بۆ خۆ لێ روینم

هندی ل ژینێ ساخ بم
ئەز دێ بۆ وێ پێژان بم
بۆ دوژمنا دێ ژان بم
چ جار چەکی نادانم

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] ئەز ژی.

ئەز خودانێ ئەسلی مە
ل سەر ڤێ کوردستانێ
ژ خودێ ب هیڤی مە
دێ بندەستێ خۆ دانم

ئەز سەرێ خۆ شووڕ ناکەم
بۆ نەیار و دوژمنا
چ جار ڕێکا وان ناکەم
بۆ وان تیر و کڤانم

کون کەم دلێ دوژمنا
گاڤا بێت سەر خاکا من
بۆ وان ناهێلم کونا
دێ پێل ستوینێ وان دانم

کوردستان دەیکا منە
حەققێ وێ سەر من هەیە
بەرهەمێ وێ بۆ منە
شەڤ و ڕۆژا پەروانم[1]

شەڤ و ڕۆژا بێ وەستان
بۆ من نینە ڕاوەستان
تا ئازاد کەم کوردستان
خوینا خۆ دێ ل سەر دانم

من چەراند دێ چەرینم
دێ خوینمێژا برینم
ڕەز و باغا دێ چینم
سنۆرا دێ لێ دانم

---

(١) دگەڕم، دچم و دهێم.

کوردستـــــــــانا کوردانــــــــه
لـــــــەوا نــــاڤ کوردســــــتانه
دوژمــــــن تـــــو بـــــاش بزانـــــه
ئـــــەڤـــــێ هـــــزرێ نــــادانم

# بانگەوازەك بۆ جاشا[1]

وەرە ڤە ئەی جاشێ جا
خۆ ژ بەعسیا بدە پاش
گوهـ نەدە پارە و مەعاش
تو وەرە کوردستانێ

تو زۆرێ گونەهکاری
ل نك کوردا و جەباری[2]
بەس گوهـ بدە نەیاری
بترسە ژ ئیمانێ

باشە فکرا تە چی یە
ریا تو ل سەر نەڕێ یە
ئەزمانێ تە کوردی یە
تو بۆ هندە نەزانێ

هلۆ هزرا خۆ بکە
بەس تو شەڕێ مە بکە
بەس ئاستەنگا پەیدا کە
دەرکەڤ ژ ناڤ گاڕانێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] (جەبار): ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (خودان هێز وشیان) ددەت.

دیارە زۆر د ترسی
بۆ بەعسێ د مەلسی
ل مافێ خۆ ناپرسی
وەرە ناڤ سەورا گولانێ[1]

ئەڤە بیست و شەش سالە
بۆ دوژمن بوویی پالە
باشە ما ئەڤە حالە
هەی گەڕهۆکێ کولانێ

ما تو شەڕێ کێ دکەی
ژ کێ ڕا ئەڤێ دکەی
تو هوسا خۆکرێت دکەی
بێ ئاقلێ جیهانێ

دەستێ خۆ ژ ڤێ بەردە
فکرا تو ل سەر بەردە
زەند و بازنا هەلدە
وەك شێرا ل مەیدانێ

تو چەندێ بێ مرادی
تە بۆ نەڤێت ئازادی
تو هۆ خودان عینادی
بۆ ئاستەنگ و هەودانێ

دێ خۆ هشیارکە توژی
بۆ تو خۆ دکی ژژوی
ما تە قەت نینە مەژی
هندە هول ڤەمانێ

---

(١) شۆڕەشا گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨).

گوهـ نەدە سەرۆك جاشا
دێ مینی ناڤ تراشا
قەت گوهـ نەدە مەعاشا
نە ترسە ژ ژیانێ

تو خۆ ددەیە کوشتن
بۆ ئەفلەقێ بن فەلە
ئاڤروویێ تە هۆ ڕشتن[1]
تو خەلکێ کوردستانێ

بنێرە ل دیرۆکێ
کا ئەو کارە تو دکی؟
بۆ ئەفلەقی[2] شۆل دکی
قەبوول دکەی فەرمانێ

شەرم بکە ژ شەهیدا
وان فێرس و عەگیدا
بۆ کێ خۆ کرن فیدا
گوهێ خۆ بدە هۆزانێ

من بۆ تە گۆت ب کوردی
ئەز چ نابێژم ئێدی
ڤێ فورسەتێ[3] بەرنەدی
ببە ئەهلێ گوهدانێ

---

(١) ڕێتن.

(٢) میشل عەفلەق (١٩١٠-١٩٨٩)، سیاسیێ عەرەب.

(٣) دەلیڤە.

ژ خۆ باقێ ڤی ناڤی
ناڤەکێ گەلەك پیسە
هلۆ ببە بالاڤێ
دا بێیە ناڤ دیوانێ

# ئازادی[١]

دا بێن ئازادی خۆشە
بەلێ من تام نەکرییە
کورد ملەتەکێ بۆشە
لێ وی ژین بندەستییە

ئازادی ژی دارەکە
ئەگەر نەهێتە ئاڤدان
برا وەرە مێزەکە
خودانی شین و گرییە

ئاڤا وێ دڤێت خوین بیت
دا ئەو تازە شین بیت
خودان دڤێت زانا بیت
دا ئەو بخوت فێقییە

ئازادی کوترا ئەسمانا
کەسێ نەدەت قوربانا
دێ مینت ل کولانا
ئەوێ ڕویس و برسییە

کوردا زۆر خوینا ڕشتی
بەلێ نە ب زانینێ
دوژمنێ خۆ یێ کوشتی
کێما دزانی ژبەر چییە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

عـــــەشـــــيركانێ و ئـــــازادى
ئێـــك و دوو قـــەبـــوول ناكـــەن
هـــەر دێ بـــت بـــێ مـــرادى
ئـــەڤ گۆتنــــە بـــــەلييــــە[1]

ڤێـــت كـــورد بـــت ب درســـتى
وەك بـــــەرەكـــــێ خۆڕســـــتى
ئـــــازادى دێ هێـــــت دەســـــتى
ئـــەڤـــە مـــن هـــۆ زانييـــــە

گـــەر مـــە كـــر مرۆڤكـــانێ
هـــەر دێ بێـــژى ئـــەو كـــانێ
هـــــەتـــــا ئـــــاخر زەمـــــانێ
ڕۆژا مــــــە هـــــــەر تارييـــــــە

ســــــەرێ تشـــــتى ئاقلـــــە
هـــەمـــى تشـــت پـــێ كاملـــە
حـــــوكم دێ بيـــــت عادلـــــە
ئـــەڤ گۆتنــــە حـــــەديســـــيە

(1) ڕۆهن، ئاشكرا و ديار.

# ئەی بارزانی[١]

بارزانی گەر تو نەبایی
تو نە خودان زانین بایی
دوژمن دامە دەنە بایی
مە شۆڕەش نەدکر ئێدی

لێ تە هەرفاندن پیلان
چەند کونفرەنس تە گرێدان
تە کێشان زۆر نەخش و نیشان
تە ڕاکرن چەند قیادی[٢]

تە شۆڕەشا کوردا نوی کر
دوژمنێ مە باش ڕەزیل کر
پتر سەرێ وی تە شووڕ کر
تو بۆ هەمیا سەیدی[٣]

بارزانی تو دارا فیقی
کوردن بۆ تە هەمی فەقی
دوژمن ژ کەربادا پەقی
دێ بن گور بن تەڤ موعتەدی[١]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(٢) سەرکردە.

(٣) سەروەر.

تو بووی مەدرەسا کوردا
رێکا خەباتێ تە نیشادا
لەوا بوونە شێرێت قادا
قەت کەسێ ل وان ترس نەدی

تو بووی خودان عەدالەت
خودانێ سەبر و سیاسەت
ل دوژمنا بوو قیامەت
کوردستانێ بۆ بەردی

هات ئەمرێ (رب العالمين)[٢]
ژ مە ستاند زەعیمی[٣] ئەمین
لەرزین ئەسمان و زەمین
تە جهە (جنة الخلد)[٤]

---

(١) زۆردار.

(٢) خودایێ جیهانیان.

(٣) سەرکردە.

(٤) بەحشتا هەتا هەتایی.

## هیڤیدارم[1]

ئەی خالقێ عەرش و کورسی
ڕەحمێ ببە ب ئیدریسی[2]
تازە و ڕەحەت لێ بپرسی
تو ل وی بکە غوفرانێ[3]

ژ هەر کەسی ڕەحمتری
چونکە تە ئەو کرە مری
چونکە ژ هەمیا مەزنتری
ئەوی ببە ناڤ جینانێ[4]

خودێ ئەم زۆر حەژێ دکەین
هەردەم هیڤیا ژ تە دکەین
سەر مە هەیە وی ئەڤرۆ دەین
ژبەر خاترا کوردستانێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی - ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(٢) ئیدریس مەلا مستەفا بارزانی، ڕۆلەکێ باش د هەر دوو شۆڕەشێن ئەیلول(١٩٦١-١٩٧٥)ێ، و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ، دا هەبوو. پشتی مالئاڤایا مەلا مستەفا بارزانی، وەك ڕێبەرێ پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عراق هاتە هلبژارتن و ل سالا (١٩٨٧)ێ، وەغەرا داویێ کر.

(٣) لێبوورین.

(٤) بەحشتێ.

حەققە دوعا بۆ وی بکەم
شەڤ و ڕۆژا دەم ب دەم
خەباتێ بکەم بێهن نەدەم
هەر دەم شێر بم ل مەیدانێ

سەد هاوارە یا ئیلاهی
تە ئیدریس بر ب ساناهی
گورِا وی بکە ڕۆناهی
ببە ناڤ باخچێ ڕوحانێ

هیڤی دکەم نە ئێشینی
تو ڕەحمەتێ لێ ب ڕەشینی
ل بەهەشتێ ب چەرینی
بدەی خاترا ڕەمەزانێ

ئیدریس تە بر تە کر شەهید
پێشڤە هاتن شێخ و مرید
ل شەهیدا بوو کەیف و عەید
بوو میهڤانێ گۆڕستانێ

ڕەحمێ بکە ڕەببی گەلەك
گاڤا چوونێ هەر دوو مەلەك
بلا نەبن گورز و خەلەك
بۆ پرسیار و بەرسڤدانێ

دا تازە ئەو بۆ خۆ روینت
چ یا حەز کەت بۆ خۆ بینت
باش بەهەشتێ بچەرینت
هەتا کو ڕۆژا میزانێ[1]

---

[1] ڕۆژا قیامەتێ.

## عەشیری[1]

مـادەم ئـەم ئیـرۆ کـوردین و لـەشـکـەریـن
پــێ نــەڤێــت بــێ تفــاقی و گوهــۆڕین
ئـەم تـەڤ مللـەتـەکـین و شـوڕەشـکـەریـن
ئـەو چ عـەشـیرکانی یـە ئـەم لـێ دگـەڕیـن

گــەر ئــەم پارتینــە و هــەیــە پرۆگــرام
بــلا بــەس بیـت مرۆڤکــانێ ئــەز خـولام
هـەتـا کـەنگی خـالو خـالو و کـوڕ مـام
مـا تـا کـەنگـی دەربـدەری و بگـەڕیـن

هیڤیـــا مـــن ژ کاربـــدەســـتا ئـــەوە
خـۆ هشـیار کـەن ئـەو مـن ئـێعلان[2] داوە
گونـــەهـــا مللـــەتـــی هـــەمـــی یـــا ل وە
دا عـــەشـــیرکانێ بفرۆشـــین نـــە کـــڕین

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] ڕاگەهاندن.

# ئەز حەیرانم[1]

ل دنیـــایێ ئـــەز حـــەیـــرانم
چ ژ وەزعـــــێ خـــــۆ نـــــزانم
خـــــودان دەرد و کـــول و ژانـــم
گـــەلـــو بێـــژن دەرمـــان چییـــە

ل وەلاتـــــی ئـــــەز رێڤیــــنگم
ئـــەزێ بـــێ دەســـت و بـــێ لـــنگم
خـــودان لێـــدان خـــودان حـــنگم
مـــــا ئــــەڤ ژیانـــــە بۆچییـــــە

ژیانـــــا ئـــــەم نهـــــۆ تێـــــدا
وەکـــی گـــەمیـــا د بـــەحرێـــدا
کـــــورد چوونـــــە ژ رێ پێـــــدا
کـــی دبێـــژت ئـــەڤ نـــە رێیـــە

هـــەوارە نـــێ هـــەتکـــا مـــە چـــوو
وەلاتـــێ مـــە ژ دەســـتێ مـــە چـــوو
بـــۆ ئاقـــل ژ ســـەرێ مـــە چـــوو
وەك مرۆڤـــێ بـــێ هـــش بییـــە

کـــوردۆ رابـــە خـــۆ هشـــیارك

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (رێناسی) یا (مەلا عەلی ـ رۆباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

تـــو تـــازه خـــۆ كاروباركـــه
هـــەڤالێـــت خـــۆ ئاگـــەهـــدار
ئـــــەڤ دەرمـــــان ب ســـــاناهييه

ببـــين ئێـــك بـــێ منـــى منـــى
ژنـــاڤ خـــۆ دەركـــين دوژمنـــى
ڕوى لـــێ بكـــين ســـەنيمـــەنـــى
ئـــــەڤـــــه ڕێكـــــا ئازادييـــــه

گـــەر ئـــەم ئـــازاد بـــين ژ دەســـت وى
ل دنـــێ مـــه پـــەيـــدا كـــر ڕوى
نـــامينم حـــەيـــران ژ دەســـت وى
دێ تـــــەنـــــابم ل دنێيـــــه

## ئەزچ جها ناحەبینم[١]

کوردستانا من بەدەوە
مرادا من نێ هەر ئەوە
هات گوهێ من دەنگێ کەوە
ئەز ڕاکرم زوی ژ خەوە

کوردستانا تازە و دەلال
ئەو نازکا شۆخ و شەپال
ئەڤینا وێ بۆ من هەڤال
عشقا دلێ من هەر ئەوە

حوببا وێ ئەز حەلاندم
وێ ئەز سۆتم ئەز قەلاندم
ژ ناڤ هەڤالا ڕەڤاندم
هزر و بیرا من هەر ئەوە

ژبیر ناکم وان سۆرگولا
بێت خەملین ل کوور و ملا
ئەو دەرمانە بۆ دل کولا
کەوا برینا من ئەوە

دەرمانە بۆ هەمی دەردا
ئەوە سەرێ هەمی عەردا
خودێ دایە بۆ مە کوردا
جهـ و مەسکەن بۆ من ئەوە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

ئــــەز چ جهـــا ناحــــەبيـــــنم
چ جانــــــا وەك وێ نـــــــابينم
زێــــڕ و زيڤـــا لـــێ دبيــــنم
خـــۆش و ژيانــــا مـــــن ئــــەوە

بـــەرێ خـــۆ بــدەن وان شـــەلالا
وان نێرگــــــــزا وان هـــــــەلالا
ئــــاوازێ تـــــەيـــــر و تـــــەوالا
بـــەهـــەشـــتا مـــە كـــوردا ئـــەوە

بـــەهشـــتا ســـەر دنـــێ ئــــەوە
جهـــێ كـــەيـــف و خـــارن و خـــەوە
هاڤينگـــــەهـــا كـــوردا ئـــــەوە
دەشــــــت و زۆزانــــــا مـــــن ئـــــەوە

ئـــەو سهـــ و ســـێبەرێـــت تێـــدا
خـــودێ تـــازە نـــەقـــش لێـــدا
گـــۆتی كـــوردا هـــــەرن تێـــــدا
كـــو داخـــــوازا وە هـــــەر ئـــــەوە

## پێشمەرگێ هۆ نینە کەسێ[1]

سـەلامێـت مـن بـۆ پێشـمەرگـا
خودانێـت تـۆپ و تڤـەنگـا
ئـەوان مێرێـت وەك پڵنگـا
مێرانیـا وان بـۆ ئـالا

ئـەڤ مێرانـی بوویـە دیـرۆك
ژ خانـەقینـێ تـا دهـۆك
دوژمنـێ خـۆ کرنـە پـەپـۆك
بوویـە هـەوارو وا وەیـلا

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (رێناسی) یا (مەلا عەلی ـ رۆباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

# ڕێکخستنا کوچەری[1]

ئەز بۆ کوردا چ بێژم
دەرەێ ژێ را ڤەرێژم
بۆ وان دورا دارێژم
دا بەس ببن دەر ب دەر

کەسێ نەبیت ئێکاتی
خاسمە ل ئەڤێ کاتی
فەرزە بۆ مە براتی
ڕێکخستن و (مۆئتەمەر)[2]

بۆ مە نابیت ڕزگاری
گەر ئەم نەکین هەڤکاری
هەر دێ مینن پشدەری
وەك هەزارێ خۆلیسەر

ڤێت هەبن ناڤ و ڕەقەم
نیرك و هەڤجار و قەلەم
هینگێ دێ هەبت بەرهەم
ئەم نامینن بێ مەفەر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] کونگرە.

هندی ل هیڤیا خەلکی بین
هەرۆ ئەم دێ برسی بین
هیچ ژ مە نایێت لڤین
هەرۆ دێ مە کەنە دەر

مرۆڤ شولکەرێ خۆ بیت
دێ ل ناڤ خەلکی ب ڕوی بیت
دێ ئازادی زوی بیت
ئاڤا بن گوند و مەقەر

ئەڤ گوندێت هو هەڕفتی
باغ و بیستانێت سۆتی
دێ ئاڤا کین ب دەستی
کەس نەشێت مە بکەت دەر

هندی کورد ژێك بەلاڤ بن
دێ ل جیهانێ بێ ناڤ بن
دێ بێ نان و بێ ئاڤ بن
بالگوهـ هەر دێ بیتە بەر

ڕێکخستنا ب کوچەری
دێ تە هێلیت پشدەری
کەس نابێژیت عنفەری
زێدەنە کول و کەسەر

ئەڤە بوو داخوازا من
هندە بوو زانینا من
کەسێ گوهێ خۆ دا من
دێ ژبن زوڵمێ چیتە دەر

# عنزالا و بابە گوڕگوڕ[1]

کوردستانا مە ڕەنگینە
تێر نەفت و پانزینە
دوژمن بەس ژ مە بستینە
نێ تە چ ماف تێدا نینە

ئەوا تو دکەی تەڤ غەدرە
هەڕۆ خوینا مە یا هەدرە[2]
تێکلیا تە هەمی زەجرە[3]
دەستا ژ مە بکشینە

ئەم خودانین تو بیانی
گونەهکار و ب زیانی
تە عەدما کوردا ئانی
کارێت تە نە یارینە

عنزالا و بابە گوڕگوڕ
لێ خودانین وەك باب و کۆڕ
چەند تو ل مە بکی خۆڕ خۆڕ
بۆ تە نابیت ئەو خەزینە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) يا (مەلا عەلی ـ ڕوبار) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن. (عینزالا، سەر ب پارێزگەها مویسلڤەیە. باباگوڕگوڕ، سەر ب پارێزگەها کەرکووکێڤەیە).

(٢) بەلاش.

(٣) نەخوەشی.

ئەڤێ دوزێ ئەز ناهێلم
تا ل قەبری ڤەدەن كێلم
ئاخا منە ڤێت بكێلم
هەتا خۆش بیت بۆ مە ژینە

ژ دهوكێ تا كەركۆكێ
تەڤ ل بەر حوكمێ فڕۆكێ
تە خوین ڕشتی وەك جۆكێ
ژ ڕەحما تە بێ هیڤیە

رژێما بەعسا پیر عجلاف
تە هشك كرن ئاڤ و دەراڤ
تە بۆ نەڤێت بۆ كوردا ماف
ما ئەم ژی نە ئیراقینە

تو ڕژێمەكا ڕوی ڕەشی
تو كێڤریشكا ناڤچاڤ بەشی
بۆ ئیراقێ نەڤێت خۆشی
هندی هوین چەند ئەفلەقینە

## شەهیدێن مە[١]

شەهیدن تەڤ پێشمەرگێن مە کوردا
شەهید بوونە سەر نامووس و عەردا
شەك نینە ئەڤا مِن گۆتی ڤڕ دا
چ قەوما زوڵم هۆ نەهاتیە سەردا

بنێڕن ل ئایەت و حەدیسا
کی بیت کوشتن ل سەر مال و نامیسا
د بەهەشتێدا وەکی ڕەئیسا
کی د سۆژیت بازێر و گوندا

گەر دوژمن ب ڕەشینت خەردەلێ
گونەهە تو ڕوینی ل مەزەلێ
دڤێت باش بزانی ڤێ مەسەلێ
دا نەبی پەپووك ل چول و عەردا

گەلی کوردا ڕابن وەکی مێرا
دەست بدەن تڤەنگ و تەڤر و بێرا
ئەڤەیە ڕۆژا خۆشمێر و خێرا
دوژمن بکوژن هەر جهێ تێدا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

کوشـــتنا وانـــا چ گونـــەهـــ تێـــدا نینـــە
چنکـــو ئـــەو ســـەبـــەبێ ڤـــی شـــەڕینـــە
چ ڕەحمـــێ پـــێ نـــەبـــن وان ڤـــەبڕینـــە
دا کـــو بچـــن نـــاڤ مـــەزبـــەلـــێ دا

یـــێ بێـــژت کوشـــتنا وی گونـــەهـــە
ئـــەو بـــێ جورعـــەتـــە خـــاوەن گونـــەهـــە
ئـــەڤ بـــوورین ســـال ل مـــە نـــەهـــ و دەهـــە
وان کوردســـتان خـــراپ کـــر و بـــەردا

موســـتەحـــەقـــێ عـــەزابـــا ئـــاگری
ئێخســـیر ببـــت ب دەســـتی لـــەشـــکەری
بـــار بکـــەن ئـــەوێ تـــەشـــبیهێ[1] کـــەری
هـــەر باشـــە جهـــووڕ[2] ب ســـەر دەڤـــی دا

---

[1] وەك، مینا.

[2] جهووڕ، ئەو تویرکە ئەوێ کایێ دکەنە تێدا و سەر دەڤێ دەوارا ڤەدکەن.

# وەلاتێ دل حەبین[1]

پیشمەرگەینە پارتینە
شڤانێت وەلاتینە
ئەم زیرەکین جندینە[2]
ئاشقێت ئازادینە

ئەم پارتینە لەشکەرین
ل ئازادی دگەرین
دا ل ملکی بچەرین
چ ملکەکێ شرینە

ملکێ مە کوردستانە
هەمی باغ و بیستانە
کورد ژبۆ وی خودانە
وەلاتەک دل حەبینە

وەلاتەک پڕ عەزیزە
تەژی فێقیێ تەمیزە[3]
تەژی باهیڤ و گویزە
هەمی نەفت و پانزینە

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(2) باش و جوان.

(3) (تەمیز) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (پاقژ) ددەت.

دڤێـــــــت شــــــڤانەك زانـــــــا
چـــــاك بزانـــــت ئـــــەزمانـــــا
ل هــــــەر چــــــار كوردســـــتانا
خـــــەلكـــێ وان تێبگـــــەهينـــــە

# چەند خۆشە ماشاللا[١]

کوردستانە باغچێ گولا
ئەو عەزیزە ل بەر دلا
ل سەر چیا و سەر ملا
چەند خۆشە دەنگێ بلبلا

بەرێ خۆ بدەن کولیلکا
ل نهال و هەمی شیڤکا
ئاوازێ تووك و تڤیرکا
خۆم خۆمە ل هەمی ئالا

جهێ سەیران و کەنینێ
جهێ نێچیر و خۆش ژینێ
وەك ئاسۆسێ وەك تەنینێ
چەند خۆشن هەزار ماشەللا

ل بەرۆژا ل نزارا
بەرێ خۆ بدەن وان دارا
ژ دار بەڕوی و دیندارا
سیبەرە ل هەر دوو ملا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (رێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

هەمی مێرگە و چیمەنە
ب ڕاستی ئەڤ خۆش مەوطەنە[1]
تەژی تێدا وارێت مەنە
ل ناڤ نەفەل و هەلالا

کوردستان زۆر دل حەبینە
کەسێ جهەك وەسا نینە
تەژی لێ مێرگە و کانینە
گوهێ بدە دەنگێ شەلالا

تەژی گرن تەژی شاخن
تەژی کەوێت لال و پاخن
دوژمن هەمی دل ب داخن
ل سەر وان بەژن و بالا

ژبۆ مە خۆش جهـ و وارە
چیا هینە چیا سارە
هەمی گاڤا لێ بهارە
گیا شینە ل نهالا

گەلی کوردا هین بزانن
جهێ کوردا کوردستانن
ئەز دبێژم هوین خودانن
وی بپارێزن ژ چەپەلا

---

[1] وەلات.

## کوردستانا زەنگین[1]

کوردستان زۆر زەنگینە
تەژی نەفت و پەنزینە
زۆر خۆشە هەوا هوینە
پر مەعدەن و کانینە

چەوا حەزکەی وەسایە
وەك مرادا دلایە
هەمی گول و گیانە
تێر خێر و هنگڤینە

تەڤ هوین وەرن تەماشا
بنێرن ل تراشا
ئەوان کەڤر و وان کاشا
لەو ژێ ڕا دل بەنگینە

تەژی گویز و هنارن
دارمازی و دیندارن
سەر و بنا ڕوبیارن
گاڤ و دەما خۆرینە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل ساڵا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

هـــەمـــى مێـــرگ و چيمـــەنـــن
خـــۆش نـــزار و بـــەتـــەنـــن
بـــۆ ژيـــانێ مـــەعـــدەنـــن
چ ئاخـــــەكـــا زێرينـــــە
ئاليشـــــكێ[(١)] تـــا هـــودانێ[(٢)]
هـــەمـــى تێكـــدا كـــومره[(٣)]
دوو گونـــــدين كوردســــــتانێ
بـــەهـــرا مـــە تێـــدا نينـــە
هــــــــودانێ ل تركــــــــا
ئاليشـــــــكێ ل ئيراقـــــــێ
ئـــــاگرێ مـــــە ژ تركـــــا
تركـــا بـــر ئـــەو خـــەزينـــە
ژ بـــانكێ[(٤)] هـــەتـــا تێركـــێ[(٥)]
هـــەمـــى كـــومر و قێـــره
هلـــۆ هـــەڕە مێـــزەكـــێ
كـــا وەيـــە يـــان وە نينـــە

---

(١) ئاليشك، ژ زۆزانێن (هۆزا سنديان) دهێته هژمارتن.

(٢) هودانێ، گوندەكە دكەڤيتە دەڤەرا سنۆريا ئاليێ باكوورێ كوردستانێ ل گەل باشوورێ كوردستانێ.

(٣) (كومڕ) واتە (ڕەژيبا بەرى).

(٤) بانكێ، گوندەكە سەر ب دەڤەرا (سنديان)ڤە دهێتە هژمارتن.

(٥) هەر دوو گوندێن (بانكێ و تێركێ)، سەر ب دەڤەرا (سنديان) ڤەنە.

ژ ڕاڤینـــــا[١] تـــــا گـــــاره[٢]

زۆر خـــــوێ تێـــــدا دیـــــاره

خـــــۆش گـــــەنـــج و عونبـــــاره

بـــــۆ پاشـــــەڕۆژێ ژینـــــە

---

[١] (ڕاڤینا) گوندکە سەر ب دەڤەرا (بەرواریان) ڤەیە.

[٢] چیایێ گارە، سەر ب قەزا (ئامیدیێ) ـ پارێزگەها دهۆکێ ڤەیە.

# ئاغایێ زگ گامێش[١]

ئەگەر تو دیموقراتی
سەر خاترا وەلاتی
مە نەڤێت چ ئاغاتی
ب شەڤ و ڕۆژا ب سەردەری

ئەگەر تە هەبت ڕێباز
یا فەرە بچی ئەڤراز
خۆ زیرەك کی مینا باز
تو دێ تازە کەی شەڕی

ئەگەر تو پارتیزانی
دڤێت تو باش بزانی
ئەوە ڕێکا بارزانی
دێ ل ئەڤرازی چی سەری

ئەگەر مەسئوول ئاغا بیت
کارێ مە دێ بەلا بیت
کوردستان ئاڤا نابیت
تا کەنگی دەر ب دەری

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

خــــەباتكــــەر ڤێــــت بچيــــت پــــێش
بــــلا ببــــت چويــــڤ ڤــــەكــــێش
گــــــەل ئاغــــايێ زك گــــاميێش
هينگــــــى خــــــودان هونــــــەرى

تــــو كــــار نــــەكــــە بــــێ فايــــدە
هــــەمــــى خــــەلكــــى تــــو هايــــدە
كــــــارى بكــــــە ب قايــــــدە
ل دوژمــــــــــن دە ئــــــــــاگرى

## ئەم دبن زوڵمێ دا مەهین[1]

هیڤیـــدارم ژ تـــە شـــاهێ کـــەریـــم[2]
بـــۆ مـــە بگێـــری مـــەسعوودێ[3] زەعـیم[4]
سەردەستێ وی تێك بچت بـەعسا لـەئیم[5]
دا ئـــازاد ببـــت کوردســـتانا قـــەدیـــم

تـــا کـــەنگـــی هـــو بمیـــنن ئیلاهـــی
تـــە ئـــەم دەر ب دەر کـــرین ســـاناهی
ل تارییێنـــــــە نینـــــــە ڕۆنـــــــاهی
(اهـــدنا یـــا صـــراط المســـتقیم)[6]

ڕەحمـــێ ب مـــە بکـــە ئـــەم گونـــەهـــین
بـــۆ ئـــەم ژی ب مـــافێ خـــۆ نـــەگـــەهـــین
نـــێ ئـــەم دبـــن ڤـــێ زوڵمـــێ دا مـــەهـــین
هاریکـــار بـــە بـــۆ کـــوردا ئـــەی عـــەلـــیم[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] (کەریم) ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (مەرد) ددەت.

[3] مەسعوود مستەفا بارزانی، سەرکردە و ڕێبەرێ گەلێ کورد، ڕۆلەکێ باش د هەر دوو شۆڕەشێن ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥)ێ، و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ، دا هەبوو، د ناڤبەرا سالێن (٢٠٠٥-٢٠١٧)ێ، سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ بوو، نوکە وەك مەرجەعێ سیاسیێ کوردان دهێتە هژمارتن.

[4] ڕێبەر.

[5] پیس.

[6] مە ل سەر ڕێکا ڕاست ببە.

خەزینا ڕەحمەتا تە پر زۆرە
ئەگەر ئەم گونەهکار بین ببۆرە
تەڤ ژن و بچووکان پورە پۆرە
بێ دایك و بابن ماینە یەتیم

دوژمنی چار ڕەخێت لەمە گرتین
نەڤێت کو ددنێ دا ئەم بژین
نێ ئەڤێ چەندێ قەبوول ناکەت دین
کو کافر ل سەر مە ببت زەعیم

بۆ چ شولا حەزکەی قادری
دوژمنی ژبن ببە ها دری
تەڤ گونەهکارا باڤێ ئاگری
دا مللەتێ کورد بمینت سەلیم

---

[١] (عەلیم) ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزن و ڕامانا (زانا) ددەت.

# ئیدریس ڕۆژا مه کوردا بوو[1]

ل سهو ئێکێ کانوینێ
ژ سالا هەشتێ و حەفتێ
دل تەڤ تەژی بوون ژ خوینێ
حەیف کو ئیدریس چوو هجرەتێ

چ بکەین ژ چەرخا فەلەکێ
ل دوور مە بوو وەك خەلەکێ
کەتین پێلا وەك کەلەکێ
ئیدریس ڕژیا وەك ستێرەکێ

چ بکەین ژ مرنا نەپەنی
مە هزر نەدکر نەدزانی
ژ مە ستاند شێرێ زەمانی
ئاڤ ڕوبیار بوو وی کر کانی

تیرۆژکا ب شەوق و شەمال
پێ ڕۆن ببوون دول و نەوال
پێ گەرم ببوون دۆست و هەڤال
عەور ڕاکر وی سەمال

تیرۆژکا هندە ب ئەسەر[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

کەسێ نەزانی ئەو قەدەر
دێ هۆ زوی ڕابت چیتە دەر
دێ مە هێلیت هۆ دەر ب دەر

تیرۆژکا چوویە سەفەرێ
غەریب هێلاینە ڤێ دەرێ
ئەو چوویە ڕێکا وەغەرێ
دەخل هێلا ل بێدەرێ

دەخل کومکر نەبرە مال
وی زەعیمێ فرشک دەلال
وی هێلابوو دۆست و هەڤال
دا ئەو بەلاڤکەن مال ب مال

ئەو توڤێ کو وی ڕەشاندی
ل هەر چار زەڤیا وی چاندی
شورەشا مە پێ شاراندی
دا بەرهەم ببت ئازادی

تازە ئەوی جۆك چێكرن
قرش و قەوال سافیكرن
هەر چار تەڕەف ئاڤی كرن
دا هەمی باش خۆڕاگرن

خاتر خواست و ل مە کر تازی
بوو شەهیدەك مینا قازی
چوو ئاخرەتێ ب شانازی
خودێ ژ هەمیا ببت ڕازی

---

(١) کارتێکرن.

ڤێت هیڤیا خۆ نەبڕین
باش و موکم خۆ ڕاگرین
مالا پاقژە لاندك زێڕین
دێ هەر هەبن خۆ پێ ڕاگرین

ئیدریس هەتا دنیا هەیە
ڤیانا تە دەڤ مە هەیە
خەباتا تە ڕێکا مەیە
سەرۆك مەسعوود سەرێ مەیە

ئەڤ دنیا هندە حیلەکەر
عالەم تەڤ ژ خۆ کریە دەر
قەت بۆ کەسێ نابت مەقەر
دێ هەر مرین نینە مەفەر

گەلی گوهدارا بەسە گۆتن
ئیدریس و باب هەر دوو جۆتن
دل و هناڤ ل مە سۆتن
قەهرێ هەستی ل مە کوهتن

گەلی برایێت کاربدەست
هەمی دەستا بکەن ناڤ دەست
فیلێ کوردا ئەڤرۆ ڤەڕەست
دێ دڕینیت پارە پەرست

خۆ هشیارکەن ئەی ئیراقی
بلا بەس بت بێ تفاقی

بـــۆ دوژمنـــا نـــەبـــن ســـاقی[1]
ڕەزیـــــل بـــبن ل بـــــەر تـــــاقی

ل دوماهیکـــــــا هــــــــۆزانێ
ئــــەوا هـــاتی ڤـــەهوینـــانێ
هـــــزار ڕەحمــــــەت وەك بـــارانێ
بـــۆ شـــەهیـــدێت کوردســـتانێ

---

[1] ئەوێ ئاڤێ یان مەی دگێڕیت.

## ئیرادا خودێ[1]

خۆزیکـــــا کــــورد زانابانــــــه
دا هنـــــده ل پـــــاش نــــهمابانــــه
ئـــهڤـــه چـــهنـــد ســـاڵ و زهمانـــه
هـــهر دکـــــن و ل پـــــاش مانـــــه

گـــهلـــۆ بـــۆ ڤـــێ چییـــه ســـهبـــهب
هـــهی هـــهوار و هـــهزار عـــهجـــهب
ئـــهم تـــهڤ بوونـــه چـــهرخ و لـــهولـــهب
ل نـــاڤ وهخـــــت و ڤـــان دهورانـــــه

چ ملـلـــــهتـــــا وهکـــــی یـــــێ مـــــه
خـــهبـــات نـــهکریـــه هنـــدی مـــه
شـــههیـــد نـــهدانـــه تـــهمـــهت مـــه
ئـــــو وهك مـــــه پاشـــــڤه نـــــهمانـــــه

دیـــــاره ئیـــــرادا خـــــودێ یـــــه
ئـــهمـــر ســـهر ڤـــێ چـــهنـــدێ یـــه
ڕهحمـــــا وی تـــــهژی عـــــهردێ یـــــه
ئـــــهو بـــــۆ هـــــهمـــــا خودانـــــه

کـــا چ حـــهز کـــهت دێ هـــهبیـــت
کـــهس نینـــه وهکـــــی وی بیـــت
ئـــهمـــر ســـهر چ کـــاری هـــهبیـــت
کـــــارێ وی دان و نـــــــهدانـــــه

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل ساڵا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیه وەرگرتن.

غـــەيـــرى وى مـــەفـــەر مـــە نينـــە
بـــەرانبـــەر وى كـــەس چ نينـــە
چنكـــــو ئـــــەو زۆرێ زەنگينـــــە
دشـــێت ڕەحمـــێ بـــۆ مـــە دانـــە

## بێ ڕێکی[1]

ئـــەڤ مللـــەتـــێ بـــێ ســـەروبـــەر
ژێ ڕا لازمــــــە خـــــۆش ڕێبــــــەر
بـــۆ وی نـــــەمایـــــە چ مـــــەفـــەر
کــی هــەیــە کــو وی بینیــت بــەرێــك

دوژمنـــــــــا لــــــێ کریــــــە زۆری
ژ هـــــــەڤ کرنـــــــە ب زۆرکـــــاری
هنـــــــد ل ژێـــــــر و هـــــــن ل ژۆری
ئــــەو نـــــە هێلانـــــە ل گـــــەلێــــك

هنــــا هـــــاری دوژمنـــــــی کـــــــر
هـــــزرا پاشــــەڕۆژێ نـــــەکـــــــر
مللــــــــەتـــــێ خـــــۆ وان قڕکـــــــر
هـــــەتـــــا ئـــــەو بوونــــە چارێـــــك

دەرمـــــان ئـــــەوە ڕابـــین ســــەرخـــوە
دەســـــت و پیـــــا بـــــدین بـــــەر خـــــوە
بشـــــارینن شـــــــورەشـــــا خـــــوە
بـــــەلکـــــو بگـــــەهنــــەڤــــە ئێـــــك

(۱) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی - ڕوباد) ئەوا ل سالا (۱۹۹۱)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

# جەژنا ئاریا[1]

سەد سەلام ل هەوە بن
گەلی دۆست و برا
ل دنێ خۆش و شا بن
هلۆن هەلکەن ئاگرا

نێ ئەڤرۆکە نەورۆزە
جەژنا کوردێ دلسۆزە
ل وان ببت پیرۆزە
ئەی گەلی شێرە مێرا

نێ ئەڤە جەژنا مەیە
باش گوهـ بدن فایدەیە
دانەرێ وێ کاوەیە
ل دنێ کر ئاشکەرا

تاری بوو کو ڕۆناهی
زۆحاك کوشت بوو تەناهی
حوکمێ وی کر دوماهی
ڕابوو دژی نەیارا

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

نەورۆز جەژنا ئاریا
خەلك دەركەفت ژ تاریا
پێكڤە چوونە یاریا
ناڤەڕاست و سەرگرا

نەورۆز گاڤا تو هاتی
كوردن بۆ تە داوەتی
تویی كەیفا مللەتی
لەو دبێژم ئەشعارا[1]

دەمێ تە دەمەك خۆشە
هەمی كەس پێ بەشووشە
مللەتێ كورد زۆر بۆشە
لێ بی پالێ نەیارا

پشتی ئیستیعمار[2] هاتی
بۆ تاری ل وەلاتی
كەر و لال بوون وی كاتی
تێن كوشتن ب هزارا

گەهشتین قرنێ بیستێ
هێشتا ستوییێن بەر ڕستێ
زك و پشت بەر بستێ
ڕادهێلن هەوارا

---

(1) هەلبەستان.

(2) ئیمپریالیزم.

زۆڕ ڕاستە یا من گۆتی
جەرگ و دل ل من سۆتی
بمرن ڕژێمێن کۆتی
دیسا گەش ببت چرا

# کرم کەباب[1]

ئـــەز حـــەلانـــدم کوردســـتانێ
کـــەتـــم بـــەنـــدا ئـــەوێ جـــانێ
ئـــەز بـــرم حـــالێ نـــەمـــانێ
وەکـــی بـــەفـــرا خـــەزیرانـــێ

وێ ئـــەز ســـۆتم وێ بۆهشـــتم[2]
کرمـــە کـــەبـــاب ئـــەز برشـــتم
عـــەقلـــێ مـــن بـــر ئـــەز نـــەهشـــتم
کـــرم دینـــێ ل کـــولانێ

کـــرم دینـــێ دەشـــت و چیـــا
کرمـــە فـــەقیـــرێ بـــەر پیـــا
مـــن کـــەس نـــەمـــا بـــوو هیڤیـــا
بـــۆ مـــە بکـــەت بـــەرەڤـــانێ

عشـــقا وێ ل مـــن کـــر ئـــەســـەر
بـــۆ مـــن نـــەمـــان حـــال و مـــەفـــەر
ژ عشـــــقا وێ بـــــووم دەر ب دەر
هـــــەلاتـــــم هـــــاتم ئیرانـــــێ

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(2) (بۆهشت) واتە (حەلاند، هەژاندن).

ل ئيرانێ مامە خەمگين
پر زێدە بوون كول و برين
ڕۆندك ل من بوون ئاڤ و خوين
سەر خاترا وێ بێن ڕوحانێ

شەڤ و ڕۆژا من خەو نينە
گاڤ و دەما من نالينە
كەسێ ئاگەهـ ژ من نينە
نێزيكە بچم نەمانێ

ژبەر خاترا وان ڕويبارا
يێن كو دخۆشن وەك مارا
نەخاسمە چاخێن بهارا
ئەون سەبەب بۆ ژيانێ

ژينا مە ل ناڤ چيانە
جهێ خۆش مێرێت كوردانە
جهێ باپير و بابانە
ئەون ڕەوشا كوردستانێ

حەققە دين بم شەرم نينە
كەسێ جهێ وەك مە نينە
هەمی مەعدەن و كانينە
دڤێت نەهێتە بەردانێ

هەر ئەوە بويكا خەملاندی
كەزی بسكێت وێ ڤەهاندی
مسك و عەنبەر لێ ڕەشاندی
دا بچينێ بۆ سەيرانێ

# حەلەبچە(1)

ل شازدەیێ هەیڤا سیێ     گونەهەك مەزن هات كرن
دێ ژبیرۆ وەكەم وی بەحسی     هوین زۆر باش گوها ڕاگرن
ئەو سەدامێ(2) كورێ بەعسێ     ئەوی فرۆكە ڕاكرن

فڕین هاتن سەر هەلەبچە     ژەهر و كیمیا لێ ڕەشاندن
مرۆڤ بوونە پارچە پارچە     كر فەرمان و ڤەبراندن
گۆت ئەڤە خەرج و خەراجە     مەزن و بچویك قەلاندن

ڤی سەدامێ ئەمریكانی     هیلاكا حەلەبچە ئانی
ژەهر و كیمیا ل سەر دانی     كر قەسابخانا ئینسانی
كەس ڤێ ناكەت گەل حەیوانی     یا كو وی ب سەر وێ ئانی

شەهید كرن ب هزارا     بوو نالێنا بریندارا
كیمیا ڕەشاند تەیارا     هەوار خودێ بۆ بێ زارا
كەسەك نەچوو بۆ هەوارا     زەر بوون بەلگێن داروبارا

گەلی كوردا خۆ هشیار كەن     زۆر شەرمە كو خۆ بەر با كەن
شەهید ل هوین نە وندا كەن     هەرن هەلەبچێ ئاڤاكەن
ئالا شەهیدا هوین ڕاكەن     دا چاڤا ب هەوە ڕاكەن

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی - ڕوباد) ئەوا ل سالا (1991)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن. د نامیلكا ناڤبریدا دیرۆوكا ڤەهاندنێ (1989/3/10) هاتیە.

(2) سەدام حسێن تكریتی، هەر ژ (16 تەمووزێ 1979)ێ، هەتا (9 نیسانا 2003)ێ، سەرۆك كۆمارێ عیراقێ بوو. ل سالا (2006)ێ، هاتە سێدارەدان.

پاشی هەرن شێخ وەسانان[1] — کا چەوا بوویە قەبرستان
دەستا بکەنە ناڤ دەستان — دڤێت قەت نەبت ڕاوەستان
ئازاد بکەن ژ بن دەستان — دا بەس ڕەزیل بت کوردستان

ڤێجا دا گەرن بەهدینا — بەرێ خۆ بدەن وان شوینا
تو دێ بینی ئەوان لینا — کیمیا خەردەل ب وان ئینا
یا حەرام ل هەمی دینا — ڤێ ژبیر نەکەن مەردینا

خۆ هشیارکە نە کورا زێ — بنێرە ل تویکا[2] و پازێ
تەژینە شەهیدێ غازێ — بێژنێ بنڤە تا زەرازێ
بکەن هاوار و داخازێ — دژی خەردەل و غازێ

مللەتێ کورد زۆر مەزلوومە — ب تایبەتی ل ئیراقێ
نێ بۆ مە هەمیا لوومە — ئەگەر نەگرن تفاقێ
پارتا بەعسی گەلەك شوومە — ئەو دکەت زولم و نیفاقێ

ڕابنە سەر خۆ ب دلێ ساف — دا کو شولێ مە بێت بەرێك
هوین خۆ نەکەنە بێ عنساف[3] — کو ل بەر مە بەرزە بیت ڕێك
خەباتێ نینە چ مەساف[4] — دێ بلا بەس کورە ڕێك

ڕێکا خەباتێ باش ڕوونە — یا بەیانە وەکی ڕۆژێ
خەبات نەکەر تەڤ دروونە — باشە چیا بکوژێ
کوردێت خراب گروونە[1] — وان چ نینە ل پاش ڕۆژێ

---

(١) دەڤەرا شێخ وەسانان دکەڤیتە باکوورێ هەولێرێ.

(٢) تویکا، گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا (سندیان) ل سالا (١٩٨٨)ێ، هژمارەکا پێشمەرگەیان ب چەکێ کیمیاوی هاتنە شەهید کرن.

(٣) دادپەروەری.

(٤) دویراتی.

ئەی پێشمەرگە زوی ڕابە تو    تو گوهبدە (لا تقنطوا)[٢]
دا کو بێ هیڤی نەبی تو    بۆ تەڤ شەڕا خۆشمێری تو
بۆ کوردستانێ شێری تو    مادەم تەڤ مللەت هاری تو

گەلی مەزن و ڕێبەرا    هنگە باشتر خۆ بشدینن
بەختێ خودێ و پێغەمبەرا    هوین شوڕەشێ ب شارینن
دا ئەم بچین ناڤ سەنگەرا    دا وێ زوڵمێ زوی هەلینن

---

[١] دفن بلند.

[٢] بێ هیڤی نەبوون.

# بلا بمرم ل ناڤ کوردا[1]

ئەز کەفتیمە دەریا خەما
بیر و هۆشەك بۆ من نەما
دۆست و هەڤالەك من نەما
کو من ببت کوردستانێ

گاف و دەما من نالینە
دل و هناف تەژی خوینە
شەڤ و ڕۆژا من خەو نینە
وەرن بخوینن قورئانێ

گەلەك دویرم ژ مەوتەنا
بۆ خودێ بن مەدح و سەنا
ڕەحمێ بکە (یا ربنا)
مە سەر بێخە گەل ئیمانێ

گاڤا کو هات ئەجەلێ من
تو من ببە سەر جهێ من
جولی دەینن سەر زکێ من
ل ناڤا هەجرا کەشانێ

من ڤەشێرن دەڤ شەهیدا
نك فێرس و وان عەگیدا
ڤیانا من ددلی دا
دێ چم نك وان سەرەدانێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی - ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

من دڤێت بمرم ناڤ کوردا
ناڤ دول و سەرێت گردا
نێ ئەز کوشتم کسول و دەردا
ئەزم عاشق بۆ وێ جانێ

عاشقێ دار و بارانم
بلبلێ دەحل و ڕێلانم[1]
کەوێ سەر بەر و کەڤرانم
ل بەر کەڤیا ل زۆزانێ

ئەزم موشتاقێ کانیا
ل ناڤ مێرگە و بەر کەڤیا
تێنە سەر برێت بێریا
دکەن داوەت و دیلانێ

کارکارا کەهر و بەرخانە
دەمێ مێژاندنا وانە
شڤان و بێریا سەیرانە
دکەن یاری و خۆ لێکدانێ

گاڤا بێریا پەزێ خۆ دۆت
دودو ملا دێ کەنە جۆت
هەر ئێکی ئاوازەك گۆت
بەرەڤ مال چوون کر ملانێ

ڕەخێت ڕێکێ ڕا گول چنی
دلێن تۆلازا هنجنی
ژبەر کراسێت چنچنی[2]
تەڤ کەتن دەریا ڤیانێ

---

[1] (ڕێل) واته (جهێ تێر داروبار).

[2] (چنچنی) واته (خال خال).

# کوردستانا من[1]

کوردستانە بەهەشتا من
ئەوە ئومێد و قەستا من
ئەوە (طەبیب)[2] و خەستا من
گاڤا بچم بەرکەڤیا

گوهی بدەم دەنگێ کەوا
گەلەك خۆشە ئاڤ و هەوا
کڤارك و ڕێڤاسن دەوا
دگەل گوشتێ پەز کویڤیا

گویشك و سۆریاز تەژینە
کاری و کەنگر ئەو ژینە
چ وەڵاتەك دل حەبینە
خۆشە بێهنا دەرگەلیا

گوهدم شڕشڕا ئاڤێ
ل سەر فەرشی سەرێ ئاڤێ
ل کورانشێ[3] و کانیا باڤێ
ئەو سویلاڤا ناڤ گولیا[1]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

(٢) نوژدار.

(٣) کورانش، ژ زوزانێن (هۆزا سندیان) د هێتە هژمارتن.

یـــــا بلنـــــــده پێنجـــــی گـــــەزا
دخۆشـــــــت ســـــــەر بـــــــاغ و ڕەزا
ســـــــەردا جهـــــێ بـــــزن و پـــــەزا
ڕەوشـــــــا شـــــــڤان و بێریـــــــا

هـــــەروســـــا دەنگـــــێ پـــــەپۆكـــــا
ئـــــەو عاشـــــقن بـــــۆ بـــــەنۆكـــــا[2]
خـــــۆش تێـــــتن دەنگـــــێ دارکۆکـــــا
ئـــــەون ڕەوشـــــا دەشـــــت و چیـــــا

وەرە بچـــــین ســـــەرێ بیرکـــــێ[3]
بخـــــوین ســـــێڤا بکـــــین ســـــیرکێ
نـــــەخۆشـــــییێت خـــــودێ ژ بیرکـــــێ
دێ دلخـــــۆش بـــــی وەك بـــــەلبویـــــا[4]

چ جـــــانن ئـــــەو گـــــول و نێرگـــــز
تێـــــك ئـــــالزین چـــــەڤـــــر و هـــــەلـــــز
کـــــەیفخـــــۆش دبیـــــت مرۆڤـــــێ کـــــز[5]
گاڤـــــا دیـــــتن ئـــــەو ڕەنگـــــە گیـــــا

---

[1] سویلاڤا ئاسۆسێ دکەڤیتە گوندێ (سویلێ) سەر ب دەڤەرا گولیانڤە.

[2] (بەنۆك) واتە (دارا کەزوانێ).

[3] بیرکێ و سەرێ خواری، دکەڤنە جۆگرافیا گوندێ (کەشان)ێ، سەر ب هۆزانا (گولیان) ڤە.

[4] (بەلبوی) واتە (بەر بویك).

[5] سل، دلمایی.

کـــەســـێ گرتـــی ئێشـــا تـــایێ
بـــــــلا وی بـــــبن کونبــــــایێ
قـــەت نـــە هـــەوجـــەی بـــەغـــدایێ
نـــك دوختورێـــــت ئـــــەجنـــــەبیـــا[1]

نـــێ ئـــەز نـــەشـــێم وەســـفا بێـــژم
ژ هێـــــــدانا وان ئـــــــەز گێــــــژم
مـــا ئـــەز ڤـــێ بـــۆ کـــێ دبێـــژم
ژ غـــەیـــری خـــەلکـــێ وان چیـــا

---

[1] بیانیان.

# ما كورد نه مرۆڤه[١]

تە چ ل من کر ئەی فەلەكێ
تە ئەز گرتم ب خەلەكێ
تە ئەز کرم ناڤ کەلەكێ
بەرێ من دا مەوج و پێلا

ما بۆچی ڕەحم تە نینە
دلێ تە ب مەڤە نینە
ما گەلێ کورد مرۆڤ نینە
تە ئەو هندە پاشڤە هێلا

ڕەحمێ بکە تو جارەكێ
بۆ مە پەیداکە چارەكێ
دا کورد بینە هەدارەكێ
بەس دوژمن لێ بکەت فێلا

دوژمنێت وان گەلەك پیسن
گەلەك بێ بەخت و خەبیسن
زۆر دەرەوکەر و خەسیسن
مللەتێ مە وان نەهێلا

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

هەتا كەنى دێ نەيار بى
دگەل مە خائين و خاربى
دگەل كوردا دين و هار بى
ملكێ وان دوژمنا كێلا

فەلەك بەسە بێ مروەتى
وەرە بكين شريعەتى
ل سەر مافێ ڤى مللەتى
نەسيبێ وان تە تێك شێلا

مانە بەسە دەورا چەپێ
تە برين ل مە دەست و پێ
بلا تە ئيمانەك هەبێ
بەس كورد مانە وەكى كێلا

# خەیالا من سەرکەفتنە[1]

هـــەتـــا کـــەنگـــی بنـــالم ئـــەز
ل مـــن حـــەلیـــان ئـــەڤ جـــەرگـــە و بـــەز
ســـــۆت دوژمنـــــا تـــــەڤ دار و ڕەز
ســـــۆتن ب ژەهـــــرا خـــــەردەلـــــێ

ب شـــــەڤ و ڕۆژا مـــــن هـــــەواره
دلـــــێ مـــــن زۆر برینـــــداره
نـــــەوی ســـــەبـــــره نـــــه قـــــەراره
دســـــۆژیت هـــــەر وەکـــــی ســـــێلێ

هـــــەرۆ بـــــێ حـــــال و بـــــێ مـــــالم
بـــــۆ وەلاتـــــی ئـــــەز دنـــــالم
دڤێـــــت دوژمنـــــا بمـــــالم
هـــــەرۆ ئـــــەڤ مـــــن ل خیـــــالێ

خیـــــالا مـــــن ســـــەرکـــــەفتنـــــە
نـــــێ کوردســـــتان دەیکـــــا منـــــە
خـــــەبـــــاتکرن ڕێکـــــا منـــــە
ل ســـــەر خـــــاترا ئـــــاڤ زەلالـــــێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

مــــه ب هــــزارا شــــههیدانــــه
ل ســــهر ئاخــــا مــــه کوردانــــه
داروبــــهرێــــت وی ئاڤدانــــه
ب خوینــا ســۆر وێ ڕەنگــه ئــالێ

نــێ ئــهم کــورد سهــ مــهلیــوون هــهنه
ئــــهز دبێــــژم هێــــژ زێــــدهنــه
بــۆ وان کوردســـتان مــهوتــهنــه[1]
دوژمــن خــۆ دکــهت خــوهیــێ مــالێ

ئــهڤــێ چوجــار قــهبــوول ناکــهم
تاریخــا خــۆ هنــدا ناکــهم
ڤێــت کوردســتانێ ئاڤــا کــهم
ببــین حــاکم ل نــاڤ مــالێ

---

(۱) وەڵات.

## وەسیەت[1]

مــــن دڤێـــت وە وەســـیەت کـــەم
وەســـــیەتـــــەکـــــا براتـــــی
گونـــەهـــە ئـــەز دەینـــەکـــەم
دا پــــەیـــدا بـــت یـــەکـــەتـــی

هیڤـــــی ژ کــــــوردا ئـــــەوە
هشــــــیار بــــــبن ژ خـــــەوە
یـــــا فـــــەر و مــــوهیم ئـــــەوە
دا بـــەس بـــت نـــە ڕەحـــەتـــی

ئێکگـــــــرتن زۆر لازمــــــــە
نـــەخاســـم بـــۆ گـــەلـــێ مـــە
کـــــارەك بـــــاش و موکومـــــە
دێ زوی گـــەهـــن قورنـــەتـــی

بــــێ تفـــــاقیێ ڕاکـــــەن
دا بــــاش ســــەرێ خـــۆ ڕاکـــەن
براتیـــێ پــــەیـــدا کـــەن
خرابــــە عـــــەشـــــیرەتــــی

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناملیکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی - ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

نابت جۆت گەل ئازادیێ
بەڤلە بۆ کوردینیێ
زانا بە ل پێشیێ
گەر هۆ نەبت تو کەتی

چ گەلێ تەنزیم[١] نەبت
هەردەم ئەو دێ بەرزە بت
دایم دێ دەر ب دەر بت
ئەو ناگەهیت پایتەختی

هیڤیدارم ژ کوردا
خۆ شاش نەکەن ل ڤرِدا
دا باش ئاڤا کەن گوندا
ئو خۆ باش فێرکەن خەتی

هیڤی دکەم ژ پارتا
نەخاسم ل ڤان کاتا
بکەن دەعوو شکیاتا
نك دەولەتێت پێشکەتی

بکەن تفاقەك تازە
چێکەن بۆ خۆ ڕێبازە
ل ئێك دوو نەکەن نازە
گەرنە دێ بن بنکەتی

---

(١) ڕێکخستی.

# دیرۆکا ژین و خەباتا من[١]

ژ هەزار و نەهـ سەد و شێست و ئێکێ
پێشمەرگەمە و هەر ل سەر ڤێ ڕێکێ

هەتا نوکە ئەڤە بیست و نەهـ سالە
ژبۆ وەلاتێ خۆ بوویمە پالە

من گەل دوژمنا نەکریە پەیوەندی
هەر دژی وی ڕاوەستامە ب توندی

وەك چیایەکێ من یێ خۆ ڕاگرتی
ل پێنجی و هەشتێ ئەز بوومە پارتی

من نەکریە بی ئەمریا مەسئۆلا
ژبۆ پێکئینانا خزمەت و شۆلا

ئەز ببووم پێشمەرگە ژبوونا ئاخێ
من نەڤیا ژینا بندەستی کەمباخێ

من دڤیا بۆ وەلاتی ئازادی
دژی دوژمنا بووم وەکی ڕوبادی

یا ژ من هاتی تەخسیری نەکر
چەکێ شوڕەشێ ب ملی ڤەکر

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن. د نامیلکا ناڤبریدا دیرۆوکا ڤەهاندنێ (١٩٨٩/٣/٣٠) هاتیە.

من خەبات کر ب شەڤ و ب ڕۆژ
ئەز نەبووم وەکی هندەکا خۆ فرۆش

ئەز هەر مامە ل ڕێزا پێشمەرگا
ل پشتی نەکسێ مە نەما بارەگا

کورد بەلاڤبوونە هەر وەکو نووکا
هەژار بووینە ل دنێ وەك پەپووکا

من خۆ سپارتە کوردستانا باکوور
ژ خزمەتا وەلات نەچووم دوور

چەوا پەیدا بوو شوڕەشا گولانێ
ئەز بووم پێشمەرگە و هاتم مەیدانێ

بینا من هزار و نەهـ سەد و چلە
ئەڤ سال عەمرێ من چل و نەهـ سال کاملە

## ڕەوشا بهارێ[1]

ب خێـــــر بێــــتن ســــــەرێ ســـــالێ
خـــــۆش بهـــــارە كـــــەســــك و ئــــالێ
ئــــــازادی كــــــەفتـــــە هــــــەر مـــــالێ
كوليلـــــك شـــــينبوون ل هــــــەر پـــــالێ
ســــــڕ و ســـــــەرمـــــا چـــــوو ژ حــــالێ
وەرن بچـــــــين ســــــــــەر نــــــــوالێ
خـــــــلاس بـــــــــووين ژ نالنـــــــــالێ
بــــــەفـــــر حــــــەليـــــا بوويــــــە تــــالێ
بهـــــــارا تـــــــازە هـــــــات حـــــــالێ
ب خێـــــر بێـــــتن جـــــەژنـــــا نــــــەورۆز

خـــــلاس بـــــوون ئــــەو ســـــر و ســــەقـــــەم
بهــــــار هــــــات ل مـــــــە خـــــــۆش بـــــوو دەم
هــــــــەمـــــــی كــــــانی بوونـــــــە زەمـــــــزەم
ڕوبيــــار بوشـــــبوون چـــــوون چـــــەم ب چــــەم
پشـــــــكێت دارا بوونـــــــە قــــــــەلـــــــەم
گــــــول و نێرگـــــــز بوونـــــــە عــــــەلـــــــەم
قـــــەت ئـــــەز نـــــەشــــێم مـــــەدحــــا بـــــدەم
كوردســــــتان بــــــوو بـــــاغێ ئيـــــرەم[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) يا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتيە وەرگرتن.

خودێ دگەل مە کر کەرەم
گەراندەڤە ڕۆژا نەورۆز

بهار هات زڤستان ڕەڤی
بەفر حەلیا مانە کەڤی
هزار ئاواز گۆتن دەڤی
گول و گیا تێك لڤلڤی
جهێ حەزکەی دێ لێ نڤی
چ بلند بت یان ژی نەڤی
پر خەملین دەشت و زەڤی
زڤستان مر و نە لڤی
هەر تشتێ ب روح ڕابوو لڤی
بوو قوچانا نیرییێت قولۆز[٢]

هات بهارا شۆخ و شەپال
بۆ مرمرا ئاڤێن زەلال
خۆش هەر کین چوون دەر نەوال
کەیفخۆش ببوون تەیر و کەوال
چوون سەیرانێ برپڕ هەڤال
وان ڕەڤاندن خەم و خەیال
وان دیتن سۆسن و هەڤال
مەدحە بۆ ڕەببێ لایەزال
ئینا بهارا رەنگا دەلال
وی بر زڤستانا ب دۆز

---

[١] باغ ئیرەم، دکەڤیتە جزیرا بوتان.

[٢] (قولوز) واتە (نێزیێ شاخ ڕاست).

بهار هات بوو سەبرا دلا
بنێڕن ل هەر چار ملا
پێكڤە هەمی باخچێن گولا
تێك ئالزین نەوعێت گولا
گول چیچەك و ڤان سۆرگولا
خۆشی ئێخستنە دلا
تەیر و تەوال و بلبلا
شەهیانە ل كوور و ملا
خەم و كوڤان چوون ژ دلا
بوونە خیڤەت تەڤ دار و گۆز[1]

تەیرا خواندن هزار ئاواز
چوون زۆزانا قوڵنگ و قاز
بەرێ هەمیا كەتە ئەڤراز
وەك شاهیا ب زرنا و ساز
خۆزی نەبان گورگ و بەراز
دامە خۆ دیتبا سەرفەراز
مە هۆزان گۆتبان ب ناز
هشیار ببان پیر و تۆلاز
ئەم بۆ خۆ ببان وەراز
دا تە ژی بن هەمی كولۆز

گول چیچەك و بنەفشۆكا
ئەو شین دبن ل ڕەخ جۆكا
وەك زینەتا ل سەرێ سۆكا

---

(١) گویز.

نیسکا خۆ دا ڕەخێ نۆکا
کەزی بەردان ڤان گەنمۆکا
گول خارن کرن وەك خەنۆکا[1]
خۆ خەملاند وەکی کۆکا
خۆ گەهاندە ڕێزا بۆکا
ناڤ شینکاتی وەك سەرۆکا
ڕەخێت ڕەزا تەژینە لۆز

ڕێ خەمل و گیا تاتاکر
زوڵم و تەعدا سەر خۆ ڕاکر
دەشت و چیا وێ ئاڤا کر
سڕ و سەرما ژ ناڤ بارکر
دار و بارا خەملا خۆکر
فیقیێ شرین وان بخۆ ڤەکر
ئیلاهی هزار جارا شوکر
ئەڤ خەزینە تە ل مە ڤەکر
تۆل ل زڤستانێ ڤەکر
ژ دەستێت وێ کرن پیرۆز

بهار هات و جان خەملی
ئاواز خۆش کر بلبلی
بۆ قەبقەبا کەوا ژ دلی
ژبەر مێ کەویێت چاڤ حلی
ل سەر کەڤرا هنداڤ گەلی
گو ل وان بوو کەوگیرێ گولی
ڕابوو کەو هاڤێتن ملی

---
[1] (خەنۆك) واتە (پشکەکە ژ هەڤجاری).

وی گازی کر مەلا عەلی
ژ وی ملی وەر ڤی ملی
خۆش بچین هێش نەبییە ڕۆز[1]

سوبحان ژبۆ وی قادری[2]
ساخ دکت تشتێ مری
بهار ئینا زستان بری
ئازاد کرین ژ ئاگری
تەڤ گول گیا شین کری
گەرم ئینا سەرما بری
ئەڤ وەختە بۆ مە خۆش کری
دلێ جۆتیارا گەش کری
عەردێ کێلایی شین کری
خۆش بوون دەشت و چیا و کۆز

بهار ژ رەنگێ جەننەتێ
خۆش خۆش ل زۆزانێت مەتێ
دێ هوین بینن وێ زینەتێ
عالەم هەمی پێکڤە کەتێ
نێ هویە کارێ قودرەتێ
کی دشێت وەسفا بدەتێ
تەڤ نە خودانێت غێرەتێ
قەت کەس نەشێت چاڤ بدەتێ
کو بینت هو زینەتێ
هەر بۆ خودێ ئەڤ ڕەنگ پیرۆز

---

(1) (قادر) ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزن و ڕامانا (خودان شیان) ددەت.

(2) (ڕۆز) پەیڤەکا فارسیە و رامانا (ڕۆژ) ددەت.

# خۆ هشیارکەن[1]

ئـەی گـەلـێ کـورد تـو نـامری مـایی
خـــودان بیـــر و بـــاوەر و هێزایـــی
کـار ل تـە ناکـەت چـەکـێ کیمیـایی
هـــەر تـــو دژی ڕژێمـــا بـــەغـــدایی

تـا بگـەهـی مـافێ خـۆ یـێ عـادل
نـــە ڕاوەســـتە بمینـــە موقابـــل
دێ ئاڤـا کـەی ئـەوان گونـدێت کاڤـل
هنـــدی ڕوح ل قـــالبێ هـــەوە مـــایی

تـو مێـرێ خـۆ ڕاگرتـی و چـەلـەنـگ
نـاڤێ تـە ل جیهـانێ دایـە دەنـگ
هـەر خـۆ ڕاگرتـی چـەنـد ببـت درەنـگ
چنکـــو ئاخـــا تـــەیـــە لـــێ ژیـــایی

کوردســـتان یـان نـەمـان ئـالا تـەیـە
ڕۆژا نـــەورۆزێ ســـەر ســـالا تـــەیـــە
پێشـمەرگـە هـەمـی عـەیـالێ تـەیـە
تـــولا حـــەلـــەبچـــێ ل پـــا[2] وان مـــایی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

[2] (پا) واتە (ژڤان، ل هێڤیێ مان).

گەلی کوردا خۆ هشیارکەن ڕابن
چوکار بێ زەحمەت بۆ مە چێنابن
دەست بدەن ئێک ل گەلێک برابن
تەوبە باشە بە ژیانا مایی

کوردینۆ بلا بەس بیت نەیاری
قرنێ بیستێ یەهێژ نەدیاری
نەیارێ زکرەش مافێ تە خواری
ل ڤێ دنیا فرەه بێ ڕێ مایی

بلا بەس بیت نەڤیان و تەفریقە
هوین پەیدا کەن هەڤال و ڕەفیقە
ئیخلاس و ڕێکخستن ئەوە حەقیقە
شەرم و هندە ڤەمایی

خۆ هوشیارکەن باش هوین بزانن
نێ هوین کورد و موسلمانن
خودان تاریخن خودان قورئانن
هوین بترسن باش ژ خودایی

گوهێ خۆ بدەن ئایەتا (واعتصموا)[١]
وەریسێ خودێ بگرن هوین هەموو
دا ژ ڕەمەزانێ نەبن ڕەموو
دا کو نەبن مەلویل و دامایی

---

[١] بگرن.

## ل سەر ڕێکێ نەدرستم[1]

بیر و هزرا ئەز پیر کرم
دەرد و ئێشا ئەز هویر کرم
ژ ڤینا وەلات ئەز دویر کرم
کەتم دەریا کول و خەما

کول و خەما ئەز ئێخستم
تێر ل وەلات نەنقستم
ل سەر ڕێکێ نە درستم
بۆ من خۆشی جارەك نەما

خۆشی هەمی ڕابوون فرین
ڕۆندکا چاڤێت من هەلدرین
دەست و پێت من هەر دوو برین
کاروانێ مە ب ڕێکێ ڤەما

ئەز و عەیال ماینە برسی
کەس ل حالێ مە ناپرسی
نادەنە مە نانەك ترسی
نەمان خێرخاز ل ڤا دەما

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

كەسەك نەما هەوار كەمێ
ئێیلا خودانێ عالەمێ
مە خلاس كەت ژ ڤێ خەمێ
ڕاكەت نەخۆشیا هەما

شەڤ و ڕۆژا ل بیرا منە
ئەو عالمێ سرا منە
دلێ من ژ ترسا وی كونە
مە ل ڤێ دنێ جهەك نەما

ڕەبی ئەژی عەبدێ تەمە
شەڤ و ڕۆژا ل هیڤیا تەمە
ڕەحمەتا خۆ دەینە سەر مە
مە ئازاد كە ژ مەئتەما

چیا(١) حەسكەی تو قادری
ما نە بەسن قەهر و گری
زۆر نەخۆشە دەر بەدەری
تو ئازاد كە كوردا هەما

---

(١) هەر تشتا.

## کانێ ئیسلامەتی[1]

حەلەبچە یا کوردانە
ب ژەهرێ بوو وێرانە
ب کارەکێ وەحشیانە
شەهید کرن ئینسانە

ب کارەکێ هۆڤاتی
ڕابوو دژی مللەتی
خۆ دکەت دیموقراتی
ئو دوژمنێ کوردانە

پا کانێ ئیسلامەتی
بۆ ناکەت سەلامەتی
گەل سەدامی لەعنەتی
حەققێ وی نەهێلانە

وی سەدامی ئەفلەقی
خلاس کرن ئیراقی
وی کارە بێ تفاقی
ناڤ عەرەب و کوردانە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ ناميلكا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن.

ل وەختێ سام و حامی[1]
تا دگەهیت سەددامی
مللەتێ مە ب عامی
ل سەر جهێ خۆ ژیانە

ئەڤە دونیا و عالەم
دێ تاریخێ نیشێ دەم
ب دەڤتەر و ب قەلەم
کوردستانا کوردانە

ب دەلیلێت ئاقلی
ئەز دێ ئەوی قانع کەم
بلا نەکەن دل کولی
کورد ژی خودان ئەزمانە

سەدام نەمر و دێ چاخی
کوردا گور دکەت ساخی
گوند سۆتن وی کەمباخی
گەلو ئەڤە ئینسانە

ما زولم تا ڤێ دەرەجێ
وەرن هەرن حەلەبچێ
دا ببینن جێ ب جێ
کانێ زولم چاوانە

[1] سام و حام کوڕێن نوح پێغەمبەرینە (س).

# دەردێ کوپینێ[1]

ئەی گەلی دۆست و برا — هوین گوهـ بدەن سوحبەتێ
وەرن روینن ڤان درا — دا ببینن لەزەتێ

بەحسەکێ خۆش و شرین — دێ بۆ وە کەم دیاری
وەك دەواتا هەلپەرین — درێژە لبەر دیواری

پێکڤە وەرن تەماشا — دا باش هوین مە ببینن
چو داوەت هو نینە حاشا — دا خەما پێ ب ڕەڤینن

گاڤا کوپین ئیعلان بوو — پێکڤە بەزین تەلیسا
عالەم پێکڤە جەما بوو — بوونە ڕێز وەك وەریسا

سوبحان ژبۆ خالقی — من نەزانی ئەڤ چبوو
عالەم پێکڤە لقلقی — مە گۆت قیامەت رابوو

من پرسیار کر ئەو چبوو — ئەڤ دونیا هو لەرزی
ئەڤ عالەمە جەما بوو — مە گۆت روستەم چوو گورزی

مە گۆت وە دیارە شەڕە — دا ئەڤژی ڕابم بچم
مرۆڤ هاتن کەرکەرە — ڕێ نەبوو تێرا بچم

ئەز گەهشتم هندەکا — من گۆتێ چ قەومی یە
ژ مەزن و بچویکا — گۆت ما تە نەزانی یە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ नامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن. د نامیلکا ناڤبریدا دیرۆوکا ڤەهاندنێ (١٩٩٠/٢/١٧) هاتیە. (کوپین، بەلگەیا ئەرزاقی، کو ل ئیرانێ ئەرزاق پێ وەردگرتن).

من گۆتی بۆ من بیژن     هیژا نەبووی درەنگی
هێشتا من هەڤال هێژن     دا بینم بێ درەنگی

گۆت مە گوهـ دا ڕادیونێ     بەیان کرن ژمارە
کر بوو بەحسێ کوپینێ     کەرە تێدا دیارە

من گۆت بەحسێ مریشکا     تێدا نەهاتبوو کرن
دا ئەم هەلدین ئەنیشکا     مە گۆت هندەك دێ مرن

هندەکا گۆت خۆزی     ئەو بەحس هاتبا کرن
دا خۆ پێ بکەینە قازی     دا بن چەنگا دا گرن

من گۆت ڕوین و برنج     ئەو ژ هەما باشترن
دێ خۆ پێ کەینە کویرنج     بۆ مێهڤانا چاکترن

خۆزیا شەکرو ئارا     ئەو ژی دا بانە مە
دا بخۆ بەینە وارا     دا رەحەت بیت دلێ مە

من ژی گۆت گەلی برا     ڕزقێ ب دەست و دانە
هەڕۆ ئەم یێل ڤان درا     جار دان و جار نەدانە

ڕزقێ ب هیڤیا کوپینێ     نێ ئەو هەرێ خلاسە
بۆ خۆ شولکەن هاڤینێ     کوپینە بێ ئەساسە

هەڕۆ ل بەر ڤا دەروکا     ژ سەرما دا ئەم مرین
ئێشا کەتیە چوکا     دا پەنیری وەرگرین

بەر دەرگیت فرۆشگەها     مرۆڤا و غولغولینی
ئێکێت ئێکی نەگەها     ژ گەلەك لقلقینی

ئاخ ژ دەردێ کوپینێ     ئەڤ چبوو هات سەرێ مە
ڤێت هەڕۆ ئەم بچینێ     ڕۆژانەیە کارێ مە

نە جارەكێ دەه جارا | ل سەر خاترا كوپینێ
دێ چینە بەر دیوارا | بۆ تاییتێ و سابینێ

بەرێ خۆ بدە پەناهندا | دەستێت وان و دەولكا
ل بازێڕ و ل گوندا | راوەستاینە سەر ڕێكا

وەكی چوونە بەر دورێ | دێ بیتە ململانێ
زێدە دكەن پۆڕپۆڕێ | مەسئولێ نفتێ كانێ

مەسئول ژی پەناهندە | وی دل ب كەس ڤە نینە
زۆرێ دفن بلندە | ئەوی ئامان تەژینە

بلا سەرمادا بمرین | مالا وی یا گەرمە
هەر بۆ حالێ خۆ بگرین | عەیال نەساخ و تەرمە

بەرێ خۆ بدە نك فڕنا | هەروەسا نك تەنویرا
وەك داواتا ب زرنا | ژ مالبات و فەقیرا

سحارییا سەعەت سێ | هەر مالەكی ئیك و دوو
كەس دورێ نادەت كەسێ | چ ئەحمەد وچ عەبدوو

بەری خۆ بدەن هێك و شانا | ئەو چاوا جان د ڕێزن
وەك كار و تێكوشانا | بۆ خارنێ زو بهێزن

بەرێ خۆ بدەن زەیت و ڕوینا | چەوا گران قیمەتن
ئەوان عەدما مە ئینا | بۆ مە كوردا نیعمەتن

زەیت باشە دگەل هێكێ | دا باش پێ بقەلینن
دێ بێ ڤەدەن كێلەكێ | دێ برسی پێ ڕەڤینن

كەسێ نەبت كوپینە | ئەوی ژیان بۆ نینە
نابیت مێهڤان حەوینە | دی بیتە سەر چەمینە

خودان کوپینێ سەر بلندە　　گەلەکی قشت و توندە
ل بازێڕ و ل گوندە　　هەچکو وی هەی فرندە

ئەو کوپینا ڕەنك تویمەن　　نادەم بە باغ و چیمەن
وێ چەوا جانە دیمەن　　باش هەلگرن بەرنەدەن

یا ڕەب بدی فرسەتێ　　دا وەر بگرم نانی
تو سەر بێخی دەولەتێ　　بەلکی ببت ئەرزانی

## ئەز کیمە[١]

دۆسـکیمە ژ بابێڤە
بـەروارییمـە ژ دایێڤە

کـەشـانیمە ژ ژنێڤە
شـنگاریمە ژ جنسـییێڤە

کـوردم ژ کوردینیێڤە
بوسـلمانم ژ دینیڤە

شـافعیمە ژ ئۆلیڤە
ئـەز مریمـە ژ مافیڤە

مـەلامـە ژ خویندنێڤە
مشـەخـتم ب دنێڤە

کـەرکـووك یـا منـە ب نـەفتێڤە
خـەباتکـارم ب ڕێڤە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ژ نامیلکا بناڤێ (ڕێناسی) یا (مەلا عەلی ـ ڕوباد) ئەوا ل سالا (١٩٩١)ێ، چاپ بووی هاتیە وەرگرتن. د نامیلکا ناڤبریدا دیرۆوکا ڤەهاندنێ (١٩٩٠/٢/١٧) هاتیە.

# بۆ ئەم نابین خودانێت دەبابا[1]

ئـەرێ گـەلـی دۆسـت و ئـەهبابـا[2]
بـۆ ئـەم نـابین خودانێـت دەبابـا
خـۆزی کـورد هـەمـی زانابـا
دا سـنۆر بـۆ ئاخـا خـۆ دانابـا

دا مـە بـەس بریـا ژار و ژیـری
دا مـە ژبیـر کربـان فـەقیـر و هـەژاری
دا بـەس ببیـان کولێـت نـەیـاری
دا هاتبیـان پـێش وەکـی ئـەربابـا[3]

بـۆچی بـۆ ئێـك و دوو ئـەم مێـرین
بـۆ ئـارێ خـۆ ل ئاشـێ خـۆ نـاهێرین
دا ب ئـازادی ل ملکـێ خـۆ بچـەریـن
بلا ئـەم هشیار بـاین دوژمـن ل خـەو بـا

کوردسـتانا ڕەنگـین و دەلال
بـاغ و بیسـتان و ئـاڤێن زەلال
دەشـت و چیـا و ئاخـا حـەلال
ژ مـە سـتاندن تـورك و فـورس و عـەرەبا

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٨٢)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(2) ئەحباب، خوەشتڤیان.

(3) مەزنان.

هەمی يێت کەن دەست کولێ
دا دەستا بەرنەدەين ژ ڤێ شولێ
دا بهێلين و ب ڕەڤين چۆلێ
دا دوژمن لێ دەت دەف و ڕوبابا[١]

هەڕن سولحێ بەس ئێك و دوو بكوژن
دوژمن هوسا دێ بۆ هەژن
هەمی ببنە ئێك چ مێر و ژن
دوژمن دێ ڕەڤيت و مريت ژ كەربا

ئەڤە عەلی[٢] بۆ وە گۆت
دلێ هەوە هەميا سۆت
دا وەهەبن ملك و جۆت
دوژمن دبێن مەرحەبا

---

(١) جۆرەکێ ئالاڤێن موزيکێ.

(٢) مەلا عەلی، هەلبەستڤانێ ڤێ ديوانێ.

## مخابن بۆ ئیدریس بارزانی[1]

مخابن بۆ ئیدریس بارزانی
ئەم هێلاین ل وەلاتێت بیانی
چوو ڕەحمەتی ل نک یەزدانی
چوو نک بابێ ب مێهڤانی

ئیدریس بوو وەکی ستێرا گەش
ئاگرێ شۆڕەشێ وی کر گەش
دوژمن ل بەر بوو مشەوەش
خەبات و تازە پێک ئانی

وی پێکئینان گورووە و پارتی
وی باش چێکر سولح و براتی
سەد مخابن ل ئەڤی کاتی
ئەجەلێ نەیلا باشتر ڕێکا دانی

ئەم ل هێڤیا وی بووین بۆ خەبەرەک خۆش
لێ سەر مەدا هات قەسەک نەخۆش
هێڤییێت مە ددلدا مان پەردە پۆش[2]
ناڤ دلادا مان بوون بارگرانی

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٨٧)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) (پەردە پۆش) ژ زمانێ فارسی هاتیە وەرگرتن و ڕامانا (ڤەشارتن و تخاڤتن) ددەت.

ئيــــدريس بــــارزانى تـــو ئيدريســــى
ديـــرۆك هـــەر دێ مينيـــت تـــەيســـى
مێـــــژوو تـــــە ب نــــاموس نڤێســــى
هــەر و هــەر دێ مينــى ڕەمــزا[١] كــوردانى

بـــەلـــێ مـــرن ئـــەمـــرێ خودێيـــە
بـــەرێ مـــە هـــەميـــا ل وێ ڕێيـــە
ســـەفـــەرا تـــە حـــوكمێ خودايـــە
وێ مـــەســــلەحـــەت[٢] چێتـــر زانـــى

---

[١] هێما، نيشان.

[٢] بەرژەوەندى.

# کوردستانا میر و پاشا[1]

کوردســـــتانا میـــــر و پاشــــا
خــــودان مـــــەعـــدەن و کاشـــا
کــێ جهــەك هــۆ هــەیــە حاشــا
ئیـــرۆ کـــەت بنـــدەســـت و پییــا

گــەلــی کـــوردا مانـــە شـــەرمـــە
لـــەوما خـــەلکـی بێتـــە ســەرێ مـــە
دوژمـــن دەســـتا دانـــن ســـەر مــــە
هـــەر هـــۆ بمینـــین بـــەر پییـــا

دێ هـــوین ژی بگـــرن عیبـــرەتـــا
بـــەس بـــەلاڤ بـــن نـــاڤ دەولـــەتـــا
هـــوین چوونـــە ڕێـــزا حورمـــەتـــا
ژ دەســـت وە چـــوو دەشـــت و چییـــا

ژ قـــەهـــرا ســـۆتم بوومـــە کـــەبـــاب
هشـــیار نـــابن پیـــر و شـــەبـــاب[2]
بـــۆ وە فـــەرن عـــود و ڕوبـــاب[3]
بـــن گـــەریـــد وەك دەلوییـــا[4]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٧/٣/٤)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] گەنج، جەحێل.

[3] ئێك ژ ئالاڤێن موزیکێ.

[4] عود و ڕوباب، ژ ئالاڤێن موزیکێنە.

هـەتـا كـەنگـى ئـەڤ عـەزابـە
تانـــك و تـــەپ و دەبابـــە
وەڵاتـــێ مـــە كـــر خرابـــە
ئـەڤـان جاشـان ئـەڤـان بـەعسـيا

خـــۆ هشـــياركەن لاوێـــن دەلال
مـا وە نينـە عـەقـل و كـەمـال
لێـك بـەرزە بـوون عـەرز و عـەيـال
وەك هـــەشـــت هـــزار بارزانييـــا

بنێـــڕن ل كـــوردێ بـــەلاڤ
ئيـرۆ كـەس لـێ ناكـەت سـلاڤ
ل مـن سـۆتن جـەرگ و هنـاڤ
ديـن بـووم كـەتـم دەشـت و چييـا

عالـــەم هـــەمـــى ڕابـــوون هـــەوا
وان چێكـــرن هـــەيـــڤ و دەوا
هـــەر كـورد مانـە وەكـى كـەوا
وان چـاڤ نـەدا ئـەجنـەبييـا[١]

شـــەرمـــێ ناكـــەن ژ جوهييـــا
ئـــەوان چـــەوا ئێـــك دوو ڤييـــا
وان گوهـــ دابـــوو ئـــەمريكييـــا
بوونـــە دەولـــەت وەك هـــەمييـــا

ئـــەڤـــرۆ جـــوهى چ بـــەشۆشـــن
كـــێمن نـــەگـــەلـــەك بۆشـــن
تـــۆپ و تـــەيـــارا د فرۆشـــن
چ بـــوون زدێـــت[٢] ئيســـلاميا

---

[١] بيانيان.

[٢] دژى.

مــه دگــۆت جــوهی مــرۆڤ نینــه
بـــــۆ مێرانــــێ وەك ڕویڤینــــــه
ئیــــــرۆ وەرە تــــــو ببینــــــه
چوونــــه ڕێــــزا ئــــەفــــەنــــدییا

# هەر دوو شینی مە کرنە ئێك[١]

ئەی بارزانی ئەی ڕەحمەتی
ئەی پەهلەوانێ میللەتی
گاڤا تو ژ ناڤ مە دەرکەتی
پێکڤە ماینە مەندەهۆش

ئەی بارزانی ئەی قەهرەمان
ل مە تاری بوو ڕێك و کولان
هەمی چاڤا لێ هات باران
ڕۆندك بارین وەك ئاڤا بوش

تو چووی ئەم ماینە یێتیم
سوبحان ژبۆ شاهێ کەریم
وی ژ ناڤ مە ڕاکر ئەو زەعیم
ئەم هەمی دل نەخۆش

ئەی زەعیمێ ئازادیخواز
ئازادی بوو بۆ تە داخاز
تو بووی شەهیدەك سەرفەراز
تە هێلا ڤالاهیەك بوش

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (١٩٨٧/٣/١٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان ـ ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

تو بووی تە گەنم قەلاندی
ل سەر پێشمەرگێت خۆ ڕەشاندی
هەر سێ دوژمن ڕەڤاندی
قەد تو نەبووی وەڵات فرۆش

دازدە[1] سالا ناڤ ئیرسی[2]
تە قەبوول بوو ڕیس و برسی
مە یەقین بوو تو نەترسی
بالگوهـ بەربوو دۆشەکا پۆش

قائید نەبوون وەك تە چ جار
دژی تە بوون هەر چار کنار
دائیم تە خۆ دکرە دیار
بۆ کوردستانا شەنگ و خۆش

تە پیرۆز بیت لێ کفن و گۆر
تەژی بیت ڕەحمەت و نۆر
ڕەبی بدێ ڕەحمەتێ زۆر
ل بەحشتێ ببیت بەشۆش

هەر دوو شینی مە کرنە ئێك
ئیدریس و باب چوونە دەڤ ئێك
دوعا بکەن هەمی گەلێك
دا دلێ وا ببیتە خۆش

---

[1] دوازدە.

[2] ڕۆسی.

هـــەڤـــال ئيــــدريس و موســــتەفـــا
كـــەســــێ وەك وە نـــەبـــوو وەفـــا
هنـــدەك ئيــرۆ مـــە دكـــەن كـــەفـــا
ب چوونـــــا وە بووينـــــە بـــــەشـــۆش

خـــەمــــا نـــەخــــۆ ئـــەم حـــازرين
دێ بـــــاش رێبــــازا وە گـــــرين
تـــــاكو ئـــــازادیێ وەرگـــــرين
بــــزدی رژێمێـــــت خــــۆ فــــرۆش

چونكــو ئـــەم كـــورد فـــەقیێت وەنـــە
هــــەردەم ل ســــەر رێكــــا وەنــــە
چ جـــارا ئـــــەم نــــابێژين نـــەنـــە
چ رۆژ خـــۆش يــــان ژی نــــەخـــۆش

# دیرۆکا مەزبەلە[١]

کوردستانا باب و باپیرا
سەدامی کورد برن جەزیرا
وەسا گەرمن وەک تەنویرا
دەست ناکەڤیت ئاڤا بیرا

ئەو جه گەرمن وەک جەهنەمێ
کەس ڤێ دکەت دگەل عالەمێ
کورد ڤێ بیر ناکەن هەمێ
ژ سەدامی وەک خنزیرا

سەدام نە زیڕە و نەزیڤە
ژ مرۆڤا ئەو نە نیڤە
پیسە دیرۆکا ئەو ب دویڤە
بلا چوو بیت جهێ میرا

کیت بێژت خۆش مرۆڤە
ئەو دین سستە و کەرچۆڤە
کەس نزانیت چ تۆڤە
مافێ خەلکێ ناهێت بیرا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٨/٢/١٥)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

دیرۆکا خۆ کر مەزبەلە
کار تێکڤەدانە و بەلبەلە
گرتن و کوشتن نە حەلە
بۆ نامینیت مافێ فەقیرا

کوردستانا تژی خێرات
ئەوی سۆت و کر خرابات
ها نێزیکە ڕۆژا وی هات
بچیتە ناڤ زەمهەریرا[١]

ئەو خوین مێژێ فەلیتە
زەعیمێ هۆ کێ دیتە
جاشێت وی لیتە لیتە
ل سەر تەخت و سەریرا[٢]

تەها محیەدین مەعرۆف[٣]
بۆ سەدامی بۆ مرۆڤ
دێل وا بیتە ئەڤە ئۆف
خیانەتا دزکیرا

وەسا تەها یاسین ڕەمەزان[٤]
ئەو بۆ نەیارێ کوردان
نێزیکە بۆ وان گۆڕستان
ئاگر دێ چیت دەڤیرا

---

[١] زەمهەریر، ئێك ژ ناڤێن دۆزەخێ و ڕامانا (سەڕما دژوار) ددەت.

[٢] تەخت.

[٣] تەها محیەدین مەعروف (١٩٢٤-٢٠٠٩) سیاسەتڤانێ عیراقی.

[٤] تەها یاسین ڕەمەزان (١٩٣٩-٢٠٠٧) سیاسەتمەدار عیراقی.

## سەر مەدا هات شەڤەكا ڕەش[١]

سەر مەدا هات شەڤەكا ڕەش
ل مە وەریا ئەو گولا گەش
كورد هەمی لێك بنە ڕەش
كوردستان هێلا بویكا چاڤ ڕەش

سەدامێ كوردا د قەلینیت
ئەوێ ژەهرێ لێ د ڕەشینیت
وی ل بەرە كوردا نەهێلیت
ئەوی سۆتن كەڤر و تراش

هەڕفاندن گوند و باژێر
كورد ڕاكرن وی برنە ژێر
پێكڤە كوشتن وی ژن و مێر
كەت ناڤ پەزی گورگێ دەڤ بەش

عەزاب دان و ئیعدامات
بۆ سەدامی بوون خەبات
كوردستان كر خرابات
خۆ ژ خرابیا نەدا پاش

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی(١٩٨٨/٢/١٥)ێ، ل (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ كوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

وی کوردستان کر چۆلیستان
بۆ کوردا نابیت ڕاوەستان
تا نە بڕن ئەوان دەستان
خۆ ژ خەباتێ نادەینە پاش

بیر ناکەین حەلەبچە و تویکا[1]
قەسابێ مەزن و بچویکا
دێ بیت فەقیرێ ناڤ سویکا
بلا درێژ بیت شۆڕەش

کورد بیر ناکەن چو تاریخێ
سەدام بچیت سەر مەرێخێ
دێ وی هاڤێژین ناڤ ڕیخێ
شەهیدێت مە ناچن بەلاش

کورد نەمرینە و نامرن
دێ ئالا خۆ بلند هەلگرن
کوردستانا خوە دێ گرن
دا ل کوردا خۆش ببیت ڕەوش

نە تو دمینی نە قادیسی
تە خوینمێژی گەلەك پیسی
ژ مەعریفەتێ تووی ڕویسی
نە شەرتێن نوکە ڕوتبە و قوماش

---

(١) تویکا، گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا (سندیان) ل سالا (١٩٨٨)ێ، هژمارەکا پێشمەرگەیان ب چەکێ کیمیاوی هاتنە شەهید کرن.

شەڤ هەر دێ بیتە ڕۆژ
بۆ خەباتێ دێ بینە نۆژ
گولا مە یا بیە بشکۆژ
ها نێزیکە بیت گولا گەش

سەدام تو نابی (هێر و هیتو)
هەشتێ سالا بمینی تو
گونەهبارێ مللەتی تو
دێ تە کوژین کەینە تەلاش

نینن وەك تە چو خرابکار
تە حەلەپچە کر بریندار
تە ژێ کوشتن پێنج هزار
تە نەزانی کا چیا ل پاش

پێشمەرکێ خۆرت و چەلەك
خودان باوەرێت گەلەك
دێل دور هەوە بن خەلەك
چ عەسکەر بیت یان ژی جاش

ڤێ بهارێ خودێ حەسکەت
پێشمەرگە دێ خۆ لەزکەت
خەباتا خۆ نا بەسکەت
دێ چێکەن حوکمەتەك باش

# ما دێ چن کەنەدا[1]

خــۆ هشــيارکە ئــەی مللــەتــێ وەك کــەوا
هــوین شــەردیــن[2] عالــەم ڕابــوو هــەوا
هــوین بــێ تفــاقن ئــەی بــرا لــەوا
خــەلکــێ هــوین ڕەڤانــدن کرنــە دەرێ

مانــە عــەیبــە بــۆ هــەوە گــەلــی کــوردا
وە مــال و عــەیــال هــەمــی ل دەردا
هــوین بــەلاڤبــوون چــون کــەنــەدا
بــۆ ئیــران و ترکــا هــوین کــەتــن ڕێ

مــا وە نــە د گــۆت دێ کویفــە چــین
مــا هــاتبوو ســەر وە ڕۆس و لــەشــکەرێ چــین
وە عــەرز و عــەیــال هــێلا ســەر رویــێ شــین
هــوین ئــەو بــوون نــە د ترســان ژ تــەیــارێ

نــزانم مــە د گــۆت ڕابــوو قیامــەت
مــە کوردســتان بــەردا کــر قــەباحــەت
کــەس نــەمــا بــۆ مــە بێژیــت سیاســەت
خــۆ پــێ بگــرین نیڤــرۆ هــەتــا ئێڤــارێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٨/٨/١٢)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] ئاوارە.

هـوين ئـەو بـوون وە دگـرتن فـەوجێت لـەشـكەری
چـــەوا ڕەڤـــين ژبـــەر جاشـــێت ســـەرســـەری
چەند جارا وە یێ د گـرتين وا یێ خۆش وە كری
ژ ترســا وان جهــ نــەبــوو بچــين هــەشــارێ

دزانـــم ترســـا وە ژ غـــازا خـــەردەل بـــوو
نـــە ژبـــەر تـــۆپ و دەبابـــا بـــوو
وە پـــاكی ب دوژمنـــا چوونـــە بـــوو
ژبـــەر هنـــدێ غـــاز ل وە كـــر نـــەيـــاری

# ژ وەختێ کاوەیی هەتا نوکە[1]

ژ وەختـێ کـاوەیـی هـەتـا نوکـە
خوینـا کـوردا وەکـی جوکـە
تێنـە کوشـتن وەکـی چوکـە
ل بنـدەسـتێ ڤـان نـەیـارا

ژبـەر هنـدێ بـێ تفـاقن
گـەل ئێـك و دوو بـێ میسـاقن[2]
ل بـەر ئێـك و دوو وەك سـماقن
کـەتـن چـۆل و بـەیـارا

ئـەو بوونـە هـۆلا مـەیـدانێ
بـۆ شـەق و پـێهن و لێـدانێ
ئـەو بـرن حـالێ نـەمـانێ
بـوون پشـتی کـێش وەك دەوارا

چـو عیبـرەتـا ئـەو نـاگرن
کـوورە ڕێکـا بخـۆ دگـرن
خـۆ ب دوژمنـی ڤـەدگـرن
ل سـەر خـاترا هنـدەك پـەرا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٩/٣/١١)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] سۆز و پەیمان.

باشـــــن بــــۆ پشــــتی کێشــــانێ
بــــۆ خوینمێژێــــت کوردســــتانێ
خـــــارنێ د دنـــــێ ل کـــــولانێ
دا نـــاڤ نـــەبیـــت نـــاڤ دەڤتـــەرا

گـەلـی کـوردا هـەتـا کـەنگـی
خـــۆ ڤـــەهـــێلن ل ڤـــی ڕەنگـــی
خۆلیســـەر وە ب چـــار چـــەنگـــی
هلـــــۆ ڕابـــــە وەك مێـــــر ســـــەرا

# ئەم بۆ چوونێ بلەزین[1]

ئـــەڤـــە چـــار مانگـــە مونتـــەزریـــن[2]
دا ل وەلاتـــــێ خـــــۆ بزڤـــــڕین
هـــا نێزیکـــە ژ کـــەیفـــا بفـــرین
بـــــۆ وەلاتـــــێ خـــــۆش و شـــــرین

ئـــــەم بـــــۆ چـــــوونێ زۆر بلـــــەزیـــــن
شـــــەڤ و ڕۆژا ئـــــەم دێ بـــــەزیـــــن
دا خۆشـــــببن دلێـــــت حـــــەزیـــــن
دا بگـــەهـــین حـــەبیبـــا دل حـــەبـــین

ئـــــەڤـــــە ژ مێـــــژە ئـــــەم ل هێڤیـــــێ
چـــاڤێ مـــە یـــێ ل ســـەر ڤـــێ ڕییـــێ
چ ئاســـــتەنـــــگ کـــــەتـــــی ڕیـــــێ
ئـــــەم هـــــەمـــــی هـــــۆ ئـــــالزین

یـــا نێزیکـــــە ســـــڕ و ســـــەرمـــا
دێ گـــــریتن ڕێکـــــا هـــــەمـــــا
ئـــەم دێ کـــەڤـــین کـــول و خـــەمـــا
پاشـــی ژ کـــەربـــا ئـــەم دێ مـــرین

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] چاڤەڕێ.

مە دڤێت وەڵاتی ئاڤا کەین
دلێت نەخۆش دێ تەنا کەین
کول و قەهرا ئەم هندا کەین
دا ل کوردا خۆشببیت ژین

ل دوماهیکا ڤی عەمری
چووباین وەڵاتی بێ مری
دا ڤەببتن دلێت تاری
دا ب ئازادیێ شاد ببین

## کا دلبەرا تلی خەنا[1]

مـــن دل پـــڕە ژ کـــول و کۆڤانـــە
ئـــەز بـــووم سـێوی ل دەر و کولانـــا
ژ کیڤـــە بیـــنم مرۆڤێـــت زانـــا
دا بـــۆ مـــە بینـــت کـــەو و دەرمانـــا

ئـــەزێ گێـــژم بـــێ هـــزر و بـــێ هـــۆش
مـــە خـــۆ نـــەدیـــت ڕۆژەك دلخـــۆش
ل دونیـــایێ بـــووم زەمبیـــل فـــرۆش
عـــەیـــال مـــا برســـی ل ژەنگـــا ددانـــا

ئـــەز پێشـــمەرگـــە بـــووم بـــۆ مـــە پالـــە
مـــە نـــە ناڤـــە و نـــە ئیقبالـــە
نـــە مـــن حالـــە و نـــە مـــن مالـــە
ئـــەز دویرکـــەتـــم ژ مـــەوتـــەنـــا[2]

ئـــەز ژ وەڵاتـــێ خـــۆ دویرکـــەتـــم
مـــن هێـــز نـــەمـــا هـــۆ ئـــەز کـــەتـــم
بـــێ نـــەســـیبم بـــێ دەولـــەتـــم
خـــۆ نـــابینم چ جـــار تـــەنـــا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەڵاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) وەڵات.

تـــەنـــا نيـــنم شـــەڤ و ڕۆژا
دل مـــن وەكـــو گـــول بـــەڕۆژا
ئـــەژى كـــوردم وەك دلســـۆژا
كـــا دلبـــەرا تلـــى خـــەنـــا

# کوڕ هێلان ساڤا[1]

گـــەلـــی کـــوردا ڕاکـــەن پێنگاڤـــا
ســـەدامـــێ گونـــەهکـــار یـــێ کـــەتـــی داڤـــا
هـــەڕن وەڵاتـــــی لـــــێ بکــــەن ســـڵاڤا
کاڤلێــــت هــــەرفتـــی دا بکـــەن ئاڤـــا

خـــۆ هشـــیارکەن گرێـــدەن بـــەرپێکـــا
هـــەڕن دوژمنـــی بـــێخن ســـێ پێکـــا
ل دوژمنـــا بگـــرن هـــوین هـــەمـــی ڕێکـــا
یـــا ل مـــە هـــەلاتـــی ڕۆژا ل مـــە چـــووی ئاڤـــا

هـــوین ڕابـــن ســـەرخـــۆ بێـــژن یـــا خـــودێ
بێـــژن هـــەواره نـــەســـەرەتـــێ[2] بـــدێ
ســـەدام بـــەرچوونـــە کـــێلا لـــێ ڤـــەدێ
زەڤێـــت خـــۆ چێکـــەن ڤـــەکـــەن دەراڤـــا

دا هـــوین ئاڤاکـــەن دێـــر و مزگـــەفتـــا
دا تێـــدا بکـــەن زیکـــر و صـــەلاتـــا
زانـــا ڤرێکـــەن هـــەمـــی دەولـــەتـــا
ل ڕۆژهـــەلاتـــێ هـــەتـــا ڕۆژئاڤـــا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەڵاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] سەرکەڤتن.

بێژن وەرن کوردا ببینن
تەعدا و زوڵمێ ل سەر هەلینن
ئاڤاکەن کوردستانێ ڤەژینن
چێکەن ڕیبارا کانی و دەراڤا

ئەم کورد مرۆڤین هەر وەکی خەلکی
ئەم خودان مافین خودانێت ملکی
جابێ بدەن دەولەتا بێژن ئەمریکی
کورد مافی دخوازن نەکو دراڤا

ما کویت چ بوو وان کرە دەولەت
نێزیکی چل مەلیون کورد نەبن دەولەت
بۆ ئەڤ عالەما خودان قوەت
پارچەکا کوردستان کورد هێلا ساڤا

## کورد ژ مرنێ ناچنە پاش[1]

سەدام کیمیا ڕەشاند
سەر حەلەبچێ وی ڤەبراند
دلێ کوردا هەمیا هەژاند
ئەڤە مافێ مرۆڤانە

حەلەبچە کر قەسابخانە
کر هیرۆشیما کوردانە
کرە دیرۆک بۆ کوردانە
هەتا ئاخر زەمانە

ئەی هەوار و سەد هەوار
شەهید بوونە پێنج هزار
بریندار بوون دەه هزار
سەدام نەیارێ وانە

ئەز هەوارێ ببم کیرێ
دلێ من سۆت وەکی کویرێ
من حەلەبچە ناچت ژ بیرێ
ژبەر ژن و زارۆکانە

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

ئەز چ بێژم بۆ حەلەبچە
باری ژەهر بۆ شێر پەنجە
بوون مشتاخە پیر و گەنجە
ل بەر چاڤێ دەی بابانە

ئەڤ کارە هیچ ناچت بەلاش
کورد ژ مرنێ ناچنە پاش
دێ تۆلا وان ڤەبیتن باش
ل سەر خاترا شەهیدانە

## وەرن دەڤ من گەلی کەو گیرا[1]

گەلی کەو گیرا وەرن دەڤ من
گوهێ خۆ بدەن ئاهـ و نالێن من
چەند کەو گیر چوون ژ کیسێ من
ئەوان ئاگر چ بەردا من

ئەز دێ چکەم رۆژا دار رەشێ
من دل رەش بوو وەکی هەشێ
چ بێژم هاڤروکێ کوورانشێ[2]
گاڤا گۆت کا حەجی حاجویێ[3] من

گاڤا چوومە بیرکێ و سەرێ خاری[4]
من هەر دوو چاڤ دبن تاری
ژمن سلن وەك نەیاری
دبێژن کا عەمەرێت من

کانێ جاسم[5] کانێ حەمێ[1]

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

(2) کورانشێ، ژ زوزانێن (هۆزا سندیان) د هێتە هژمارتن.

(3) حەجی حاجۆ کەشانی گولی، ئێك ژ مەزن و ڕهسپیێن گولیان بوو.

(4) بیرکێ و سەرێ خواری، دکەڤنە جۆگرافیا گوندێ (کەشان)ێ، سەر ب هۆزانا (گولیان) ڤە.

(5) جاسم تاهر سیمۆ، خەلکێ گوندێ (کەشان ـ دەڤەرا گولیان).

بــۆ وان دگريــت كــێلا مــەمــێ[٢]
ئــەز نــەشــێم چ جــار بــا بــدەمــێ
چــوو بــەر دلۆڤانيــا خــودێ مــن

چ بێـــژم ئاليشـــك[٣] و ئاسۆســـا[٤]
مـــرن خۆرتـــە كـــەتـــە بۆســـا
مـــام بـــێ هـــەڤـــال مامـــە هۆســـا
كـــول و كۆڤـــان مانـــە بـــۆ مـــن

ســـەركـــێ ڕەشـــينێ و بيتـــەلمـــا[٥]
ئـــەو هـــاتن مـــن ب كولمـــا
وان ئـــەز خـــارم ب لومـــا
ڕۆنـــدك كـــەتـــن ژ چاڤێـــت مـــن

دونيـــا نـــەوارە بـــۆ كـــەســـێ
ئالـــەم ئێخســـتە وەســـوەســـێ
مـــا چبكـــەت عـــەليـــێ بـــەســـێ[٦]
هـــا نێزيكـــە بـــت دورا مـــن

---

(١) حەميد (حەمێ) ئەحمەد كەشانى گولى.

(٢) كێلا مەمێ، دكەڤيتە دەڤەرا سنۆرى ل باكوورێ كوردستانێ.

(٣) ئاليشك، ژ زۆزانێن (هۆزا سنديان) دهێتە هژمارتن.

(٤) ئاسۆس، ژ زۆزانێن (هۆزا گوليان) د هێتە هژمارتن.

(٥) سەركێ ڕەشينێ و بيتەلما، نێزيكى گوندێ كەشانێنە.

(٦) (بەسنا) ناڤێ دەيكا مەلا عەلييە، خەلكا گوندێ (بيركياتێ) سەر ب دەڤەرا (بەروارى ژێريان) ڤەيە.

# مادەم مەسعوود مەوجوودە[1]

ئەری مللەت هەتا کەنگی
تو دێ مینی ل ڤی ڕەنگی
گەلەك یا ل مە بی درەنگی
بەلاڤبووین کەتینە چۆلا

خۆ هشیارکەن وەك مرۆڤا
هوین نەترسن ژ کورۆڤا
دا هوین شینکەن زەڤی و شۆڤا
خۆش مێر ئەوە بکەت شۆلا

ڕابن سەر خۆ، خۆ بکەن ئێك
خۆ ب نزامێ بینن بەریێك
هەمی پارتی خۆ بدەن گەلێك
هەمی پێکڤە هەڕنە شۆلا

هوین گوهبدەن ڤێ گۆتنێ
دەنگ ژی ناهێت دەستێ ب تنێ
هوین بەلاڤبوون ل ڤێ دنێ
چوون بەر شەقا وەکی هۆلا

هلۆ بینن ناڤێ خودێ
دا ئەو بۆ مە نەسرەت[2] بدێ
پاشی چەکی دەستی بدێ
هەرە جەنگی وەکی پۆلا

---

(١) ڕەشین و بیتەلما، ژ زۆزانێن (هۆزا سندیان) دهێنە هژمارتن.

(٢) سەرکەڤتنێ.

هــەواره مــەتــین[1] و حــــەمرینـــی
ئــەی پێشــمەرگــە بــۆ چیــت ڕوینـــی
وەره لـــەز بکـــە بـــەســـە شـــینی
شـــــــەهیــــــــد زۆرن ل دەر و دۆلا

شــــەهیـــــد زۆرن ل نـــــاڤ شــــاخا
شــــەوقـــێ ددەن ل چـــــار تاخـــــا
ئـــەوێ ل وێـــرێ ل هێڤیـــا ســـاخا
دا ســـاخ بچـــن دگــــەل مسـئۆلا

بـــــلا بـــــین قـــــەت نـــەترســـــن
بـــــلا ل مــــافێ مـــــە بپرســـــن
ڕێکخســــــتنێ تــــــازه برێســــن
داڤـــەکـــەن تـــۆلا ســــەر قـــۆلا

گــەلـی کــوردا خــۆ گیــرو نـەکـەن
دا حـــەلـــەبچـــێ ژبیـــر نــــەکـــەن
تــۆلا شــەهیــدان هــوین ڤــەکــەن
خـــوین یـــا ڕشـــتی تـــە ژی گـــولا

شـــەهیـــد نـــاچن ب بـــەیهـــۆده[2]
مـــادەم مـــەســـعوودێ مـــەوجـــۆده
دێ ژ نـــــەیـــــارا ســــینینك کـــۆده
ئـــەو دێ ڤـــەکــەت هـــەمـی تـــۆلا

---

[1] چیایێ مەتینی دکەڤتیە قەزا ئامیدی – پارێزگەها.

[2] (بیهوده) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج) ددەت.

## ماینه ساڤا[1]

هــەتــا کــەنگــی ڕۆژا مــە بمینیــت ئاڤــا
بــلا بهــەلێــت خــۆدا مــالا تــە ئاڤــا
نــێ ئــەم پاشــڤەمــاین ماینــە ســاڤا
ماینــە فــەقیــر و هــەژار ل ڤــێ جیهــانێ

هــەتــا کــەنگــی ئــەم شــین و ڕەشــبین
ل ڤــێ جیهــانێ بــێ مــاف و بــەش بــین
ل بــەر نــەیــارا دێ تــەحــل و ڕەشــبین
ســـەدامـــی کـــورد برنـــە نـــەمـــانێ

مــە ئــاخ نــەمــا شــەهیــدا لــێ ڤــەشێرین
ل ئیرانێ بارزانی بۆ شەهیدا زەڤی کرین
هێڤیـــدارین ژ تـــە ڕەبـــی ئـــەم مـــرین
بکــە ڕەحمــێ مــە بگــەرینــە کوردســتانێ

ب هـــــزارا کـــــوره و ســـــەقـــــەتـــین
چ وژدانـــە ژ ملکـــێ خـــۆ ڤـــەقـــەتـــین
دوژمنـــا کوشـــتین و ڕاتـــەقانـــدین
ئیلاهـــی ژ کـــێ بخـــازین ئـــەمـــانێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٠/٢/١٠)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان ـ ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

ئیلاهی کولیلکێت بهارا مە چرمسینە
دلێ مە کوردا هەر قورمچینە
فەقیر و هەژار هەرۆ برسینە
هەر چار کنار ل مە دکەن فەرمانێ

یێت بووینە هەلا بەر پێت دوژمنا
وەك وی ماری یێ کوشتی ژنا
بێ رێ و کولانن نابینن کونا
رویس و پێخاسن بەر بەفر و بارانێ

عەلی تو بگرە ئەڤی قەلەمی
تو بنڤێسە دیرۆکا ڤی دەمی
بۆ چاڤێت دوژمنا تیژکە قەلەمی
ل سەر خاترا کورد و کوردستانێ

## هەژاری[١] موكریانی[٢]

شاعرەك وەك هەژاری
ئەسمانێ مە كر تاری
چوو ڕەحمەتێ ژ ڤی واری
شاعیری ماقوول و هێزا

هەر سال ل ڤا وەخت و چاخا
دل دكەڤن ئاخ و داخا
هەوار و تازیە ب ساخا
دمینن وەك كەر و گێژا

چ شاعرێ زمان فەرهەنگ
ل كوردستانێ بۆ فەقیر و دەنگ
چوو ڕەحمەتێ زانایێ شەنگ
هەمی چاڤا ڕۆندك ڕێژا

ئەی هەژارێ موكریانی
هەرە سلاڤكە بارزانی
پیرۆز بیت ل وە مێرانی
وە دەردێ دایە خوینمێژا

---

(١) هەژار موكریانی (١٩٢١-١٩٩١).

(٢) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (١٩٩١/٢/٢٧)ێ، ل دەڤەرا (ڕاژان - ڕۆژهەلاتێ كوردستانێ) هاتیە ڤەهاندن.

دەما ڤی کوردا هەلینا
مەدالیا بارزانی ئینا
و ئەم هێلان ل ڤان شینا
مە دیت سۆت و برێژا

ڕەحمەت تە لێ بن ئەبقەری[1]
تە قورئانا تەفسیر کری
هەروەسا شیعرێت جزیری[2]
تو چوویە ڕێزا سەر بێژا

هەژار نە هەژار بوو
بۆ زانینێ قوماندار بوو
بۆ دوژمن بەرامبەر بوو
زانین بۆ کوردا دارێژا

هەژارێ میللەتێ خۆ بوو
شیعرو هۆزان ل وی زۆر بوو
دۆزا میللەت بۆ وی بار بوو
گەلەك ئاخینك وی هەلمێژا

وی کوردستانا نەخشاندی
خەلکێ تازە تێگەهاندی
نەزانینا ڤەبراندی
دا نەهێلیت دەست قرێژا

---

[1] زیرەك.

[2] مەلا ئەحمەدێ جزیری ناڤدار ب مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠).

عــەلــى دەســتا ســەر ئــەڤرازكـــەن

ڕەحمـــەتـــى ژ خـــود داخازكـــەن

دا هـــەژارى ســـەرفـــەرازكـــەن

شـــــاعيرێ زانـــــا و هێـــــژا

# ئەڤینداری[1]

سـوٚتم حـەبیبـا دل بچـین
مـە رێ نینـە دویڤـرا بچـین
دلێـت عاشـق خـڕ قـورمچین
کوشـتم غـەزالا چـاڤ گـەریـن

کوشـتم کـر و تـەرم و کـەلـەش
ئـەز حـەلانـدم وان چاڤێـت رەش
رەحمـی بکـە ل دویڤ مـە ب مـەش
ئـاگر کـەتـە دلـێ حـەزیـن[2]

نـێ تـە عالـەم دیـن و هـار کـر
ئـەڤینـا تـە ل وان کـار کـر
دلـێ هـەمیـا ژ ژنـا سـاڕ کـر
بـێ حـەمـدێ خوٚ ل دویڤ تـە بـەزیـن

رەحمـێ بکـە تـو جـارەکـێ
دا ئـەم ببینـین چـارەکـێ
دا ئـەم ببینـین تـدارەکـێ
دا تـە ژ بـابێ بخـوٚ بخـازین

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٩١/٤/٢٠)ێ، ل باژێرێ (دیانا) هاتیە ڤەهاندن.

[2] ب خەم.

راکە پەردا ڕەش و تاری
دا ئەم بکین کەیف و یاری
نێ تە دا مە ژەهرا ماری
کرم نەساخێ ناڤ نڤین

عەلی دلێ خۆ خۆش نەکە
شەڕێ ژنا یێ بێ چەکە
هشیار بە خۆ تێکەل نەکە
بۆ تەیە سەرشووری و ڕەڤین

# ئەڤینی[1]

ئـــەرێ دلبـــەر كـــانێ ئـــەو ڕۆژ
وەكــی ب دەســتی ڤــەدبــن بشــكۆژ
وەرە دەڤ مـــــن ب شــــــەڤ و ڕۆژ
ئـــەز عاشـــقم تـــەی گولبـــەڕۆژ

تــە ئــەز كوشــتم كــرم هــەســتی
كــرم كــەلــەخ ل بــەر دەســتی
تــە عیشــقا مــە یــا ڤــە بــەستی
تــە ئــەز كــرم هــەســتی ڤــەڕۆژ

تــە ئــەز گــرتم كــرم قــەیــدێ
هــەر تــو دشــێ تــو مــن بــەردێ
بــەس تــو بێــژە هــەرە هــەیــدێ
كــو بچــم تێكــرا ببمــە نــۆژ

ڕەحمــێ بكــە لــەش حــەلینــێ
تـــو یـــێ فـــەرخـــا ل هێلینـــی
دەرمـــــان بكـــــە ڤـــێ برینـــێ
ببــە دوختــور جــەرگــی نــەســۆژ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (١٩٩١/٤/٢٨)ێ، ل (گوندێ مەزنێ ـ دەڤەرا بارزان) هاتیە ڤەهاندن.

نێ عاشق پڕ حەلاندن
هەمی تۆلاز ڤەبراندن
گەلەك پیلان ڤەهاندن
تە ڤەشارتن ئەو بێ نڤێژ

تە دین كرم بەردام چەما
تو سەبەبی بۆ ڤان خەما
تو یا بوویە قیبلا هەما
تو یا ل پێشمە ب شەڤ و ڕۆژ

هەمی جەحێل بوون پیرەمێر
ئەوا ل دەڤ تە نەدیت چوو خێر
تو ل هەمیا بووی پەنجەشێر
ژبەر زلفێ تە یێن درێژ

گاڤا زلفا تو د هەژینی
شێخ و مەلا قەد بڕینی
تو سەر تیك و هنگڤینی
بۆ مە دەرمان بەژنا درێژ

سۆر و سپی تلیا تەیفی
دگەل عاشقا تو بێ كەیفی
گەر تو بمری گەلەك حەیفی
ڕوباد دێ مینت لال و گێژ

# بهارا ڕەنگ بەحشت[1]

خۆش بـوو بهـارا ڕەنـگ بـەحشـت
تـازە دەلال بـوو جـان گـەهشـت
سـڕ و سـەرمـا لادانـە هشـت
دەشـت و چیـا تـەڤ خـەملـی

بـەرێ خـۆ بـدەنـە دەشـت و چییـا
بـاش خـەملـی ژ گـول و گییـا
یـا خۆشـە چـاوا دل ڤییـا
خۆشـی ئێخسـتە ڤـی دلـی

گـرك و بـەتـەن سـۆر و زەر بـوون
عاشـق گـەلـەك بـەرانبـەر بـوون
کەیف و سەیران گەلەك فەر بوون
خـۆش هـات ئـاوازێ بلبلـی

گـەنم و جـەهـا گـول شـووڕکرن
دار و بـارا سـە کـومکرن
تـەیـر و کـەوا خۆڕخـۆڕ کـرن
ل سـەر کـەفـرا دارێـت چـۆلی

هـەمـی تـەیـران ئـاواز گـۆتن
تـەڤ نێـر و مـێ پێکڤـە جـۆتن
دلێـت غـەریبـا پـڕ سـۆتن
پـڕ دلـێ شـاعر حـەلـی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩١/٥/٦)ێ، ل (گوندێ مەزنێ ـ دەڤەرا بارزان) هاتیە ڤەهاندن.

بێری ڕابوون چوونە بێرێ
ئەو کەفتبوون کەیف و خێرێ
خۆزیا ئەژی چووبام وێرێ
ل بن سیبەرا ل دەرێ گەلی

هات وەختێ کەیف و کەنینێ
وەرن دا بچین ناڤ جنینێ
دا ببینین وێ خزینێ
تەشبیهێ بویکا خەملی

بۆ باریارا بەرخ و کارا
بۆ مرمڕا بن گوهارا
ل بن سیبەرا دارا
ڕەقاس و داوەت کەملی

شڤان کەتە سەر چەمکی
بیری چوونێ ب شمکی
ئەوان کوشتن کورێن خەلکێ
هەمی پێکڤە چوونە ملی

کرن داوەت و شەهیانە
کر داوەتا مل ملانە
ستران گۆتن ب گۆڕستانە
چ خۆشە دەنگێ عەندەلی[١]

---

[١] ناڤێ باڵندەکی.

## ئەڤینداری (مەهرا قیامەتێ)[١]

کــانێ حــەبیبــا خــەمــرەڤــین
ئێـــدی ل مـــن زاهێـــت لڤـــین
خـــــۆزی هاتبـــــا دا بـــــاخڤین
بــەلکــی بگــەهــین ســەلاحــەتــێ

ســـەلاحـــەت باشـــترین کـــاره
عیشـــــقا جـــانێ چ غـــــەداره
دلـــێ مـــن کـــر بریـنـــداره
وێ ئـــەز بـــرم هیلاکـــەتـــێ

جـــارەك وەره بکـــــە ڕەحمـــێ
کـــرم کــەبــاب ل ســەر فــەحمــێ[٢]
بکـــه چـــارەك بکـــه شـــەرمـــێ
دێ بــێ حـــەجـــی ل عـــەرەفـــاتێ

وەره دلبـــــەر ژ خـــــودێ بترســـــه
تـــو ل حـــالێ مـــن بپرســـه
بـــەلکـــی ڕابیـــت ل مـــن ترســـه
جـــــارەك وەره هدایـــــەتـــــێ

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩١/٥/٧)ێ، ل (گوندێ مەزنێ ـ دەڤەرا بارزان) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ڕەژی.

مـا نــه بــەســه مــن ڕەزيـل كـەی
نــێ هــەر جــارەك تــو دێ شــویكەی
مـا دێ ئێــك دی ژ مــن چێتركــەی
تــه ئــەز بــرم ســەكــەراتــێ

هــەتـا كـەنگـی ئـەڤ خـەيالــه
مــه ب شــەڤ و ڕۆژ نالــه نالــه
ئــەڤ هــەبينــه نــەچــوو حالــه
ســەر دكێشــيت خوســارەتــێ

يــا بــاش ئــەوە بێــی حــوزۆرێ
دا بــەس بكــەم پــۆڕە پــۆرێ
تــو يــا بــووی قورِســەكــێ نــۆرێ
وەرە دا ڕوينــين ســوحبەتــێ

ڕۆژا خــەلكــی هــەميــا هــەلات
دانــه ئێــك دوو زێــڕ و خــەلات
ئـەزێ دكـەم سـەعـی[١] و خـەبـات
دا بــۆ تــه بيــنم كــزوەتــێ

تــو ژ عــەلــی ببــه ڕازی
تۆپكــه بــەر خــۆ ڤــی جيهــازی
وەرە دا بچينــه نــك قــازی
ببــڕين مــەهــرا قيامــەتــێ

---

[١] بزاڤ.

## وەلاتێ مە[1]

چـــەنـــد بكـــەم مـــەدحـــا وەلاتـــی
رۆژ ل مــــــە يـــــا هــــــەلاتــــــی
رۆنـــــــــاهی يـــــــــا دای وەلات
بـــــۆ كـــــورد وەك خــــــەلاتــــــی

ئاخـــــــا بــــــــاب و بــــــــاپیرا
جهـــێ غـــــەنـــی[2] و فـــــەقیـــرا
دەركــــــــــەفــــــتن ژ زنجیـــــــرا
ب هاریكاریــــــا خـــــــەبـــــــاتێ

وەلاتــــــــەكــــــی زێرینــــــــــە
كـــــەســـێ مــــاف تێــــدا نینـــــە
كــــــوردا یــــــا رشــــتی خوینــــە
وەك خـــــــــابووری و فراتــــــــــێ

حــاجی عــومران و عــەلــی بــەگ[3]
زۆر ســـــــەبـــــرینن گـــــــەلـــــەك
ســـــەیرانـــی تێنـــێ گـــــەلـــەك
هـــاڤین گـــەهیـــت بـــەركـــەتـــێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەفتی (١٩٩١/٨/١٩)ێ، ل (گوندێ مەزنێ ـ دەڤەرا بارزان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] زەنگین.

[3] هەر دوو دەڤەر سەر ب پارێزگەها هەولێرێ ڤەنە.

رەواندز و شەقلاوا
چەندێ لێ هینە هەوا
خۆش تێت لێ دەنگێ کەوا
ژ کەیفا دی بەهەشتی

سیپلك و خەلێفان[1]
ئەو ژی خۆشە وەکی کەوان
مە گەلەك دا لێ قوربان
هەتا کەتە بەردەستی

جهێ تێشت و ڤراڤینا
جهێ ئاغا و خاتینا
کوردا قڕا خۆ ئینا
هەتا لێ بووی سەربەستی

هەمی کانی و سولاڤن
هەمی مێرگێت ب خۆناڤن
کەفر و کاشی ل هنداڤن
وان سیبەرێت بەرکەفتی

یا تژیە ژ دار و بار
هەمی دەما وەك بهار
گەلەك ڕووبار تێنەخوار
پێکڤە د چن سەر شەتی

سیروان و خابوور و هیزل
ڕووشین و خازر و گومل
ڕوو زەرك و زی و مل ب مل
دچن ژێریا وەلاتی

---

(١) سیپلك و خەلیفان، سەر ب پارێزگەها هەولێریڤەنە.

هــــەمـــــى كـــوخ و شــــكـەفـــتن
كـــەلهێـــت دوژمنـــا كـــەفـــتن
دوژمـــــن هـــــەمـــــى ژى ڕەفـــتن[١]
ژێ دەركـــــەتـــــن بـــــن كـــــەفتـــــى

كـــــــەزان و بـــــــەرى مـــــــازى
خـــــودانێ خـــــۆ بكـــــەن ڕازى
ســــــــەر بلنـــــــدن وەك قـــــازى
هــــــەمـــــى گاڤــــا ســــەركـــــەتـــــى

عــەلــى ئــەڤ هــزرا هــۆ تــە كــرى
گۆتنێـــــت وەكـــــى كـــــەڤـــرى
دوژمـــــن ژ كـــــەربـــا مـــــرى
ڕوبـــــاد چـــــەنـــــدێ ميقـــــاتى

---

[١] (ڕەفتن) پەيڤەكا فارسييە و ڕامانا (چوون) ددەت.

## چەند وی هەبن کاتیۆشه[1]

ئـــای هـــەواره بـــۆ ڤـــی حـــالی
چ هـــات ســـەرێ ڤـــی عـــەیـــالی
بـــاژێڕ هـــەمـــی مانـــه خـــالی
ڕەڤـــین هـــەمـــی ژ قـــەتـــلا عـــامی[2]

چ حالـــەکـــێ پـــر نـــەخۆشـــه
عـــەرز و عـــەیـــال گـــەلـــەك بۆشـــه
ســـڕ و ســـەرمـــا بـــۆ وان تۆشـــه
ڕەڤـــــین ژن بـــــێ زەلامـــــی

کـــەتـــم چـــۆلێ رویـــس و برســـی
ب ســـــەر کـــــولی و پێخاســـــی
گـــــەلـــــەك ب تانکـــــا کراســـــی
بـــــۆ ڕەڤینـــــەك بـــــێ نزامـــــی

بچـــووك ژ دەیبابـــا بـــەرزه بـــووون
وان نزانـــی کـــی کیڤـــه چـــوون
کـــەســـێ ژ وان هـــەوار نـــەبـــوون
بـــاوەر بکـــەن ژ ڤـــی کـــەلامـــی[3]

---

[1] ئەڤ هەلبەسته ل ڕێککەڤتی (١٩٩١/٨/١٩)ێ، ل (گوندێ مەزنێ ـ دەڤەرا بارزان) هاتیه ڤەهاندن.

[2] کوشتنا ب کومەڵ.

[3] ئاخڤتن.

هاتن سەر مە هیلیکوپتەر
عەرز و عەیال کر کەر ب کەر
وەسا دەبابە هاتن سەر
ژن فەرق نەبوو ژ زەلامی

دلێ من سۆت ب پیرەژنا
تەعدا ل وانکر دوژمنا
(ارحم بنا یا ربنا)[1]
ژ کوردا ڤەکە تو سەدامی

پێل عێراقێ بوویە بەلا
ئەو ناهێلیت شێخ و مەلا
شەعبا کوردی کر موبتەلا
نا گوهە دەت ڕەئیا عالەمی

وی حەلال کر بۆ خۆ ئەنفال
بۆ مە نەهێلا حال و مال
هەر دێ بۆ وی هێتە زەوال[2]
کورد خلاس نابن هەمی

چەند وی هەبن کاتیۆشە
میللەتێ کورد یێ بۆشە
کورد نابن خۆ فرۆشە
ئەو دبن ئێک ب تەمامی

---

(١) خودێ تو دلوڤانیا بمە ببە.

(٢) داوی.

کــــــورد نــــــاهێلن ڤـــــێ دۆزێ
پێکڤــــــه دێ گرێــــــدن ســــــۆزێ
دێ ســــــەر خـــــۆ ڕاکـــــەن تـــــۆزێ
قـــــەبـــــوول ناکــــــەن خــــــولامی

# هەژارێت ئێخستین فرۆکە[١]

گەلی کوردا نەکەن حیلا نەخون پارا
ما نە بەسە هەتا کەنگی کا مافێ هەژارا
بینن بیرا خۆ شەڤێت تاری بن بەر و دارا
زارۆك و دای ژ رسا سەرما د نالین وەك بریندارا

فەقیر و هەژار وە دان پشت گوهی
وە مافێ وان خاری ب ئاشکەرا و ساناهی
ما ژ بیرا وە چون ئەنفال و ڕۆژا دوهی
وەك هەژارەك تێتە دەڤ وە دێ ئاخڤن ب کوهی

ما نە ب تنێ کوردینی کریە ئەڤرۆکە
تو خۆ ل سەر وان مەزن دکەی ئیرۆکە
فەقیر و هەژاربوون د ئێخستن فرۆکە
ژ زویکا ژبیرا تە چو خاکورك و خەنۆکە

تە کرین قەسر و قوسیر و ترومبێل
هەمی ب حیلە و حەوالە و ب فێل
فەقیری نینە نە بزن و نە مەهـ و چێل
ل پاش ڕۆژێ زەربەك دێب تە کەڤیت حێل

دێ پەشیمانبی ل سەر کارێ تە کری
وێ هزرێ بکە نامینی ساخ دێ هەر مری
هەر نوکە ڕابە بۆ حالێ خۆ بگری
توبە بکە هێشتا خالقی تو نە بری

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٣)ێ، ل (خلێفان ـ قەزا سۆڕان) هاتیە ڤەهاندن.

شــــــورەشـــــا ئـــــەيلـــــول[1] و گـــــولانێ
شـــــاهدن بـــــۆ هـــــەمـــــى فـــــەقيـــــر و ژارا
ئـــــەو بـــــوون بـــــەرەڤانێـــــت كوردســـــتانێ
ئـــــەڤـــــرۆ مـــــان ل بـــــەر تـــــاق و ديـــــوارا

وە يێـــت كـــرين بـــەرخـــوە چـــەنـــد كـــراس
فـــــەقيـــــرێ مـــــاى مفلـــــس و پێخـــــاس
وە يێـــــت هـــــێلاين برســـــى و ڕويـــــس و خـــــاس
عـــەلـــى ئومێـــدە دێ هێـــت ســـەر وە قيســـاس

---
[1] شۆڕەشا ئەيلول (١٩٦١-١٩٧٥).

## هەوارە خودێ[1]

هـــەوارە خـــودێ تـــو ڕەحمـــانی
حـــالێ مـــە کـــوردا بـــاش دزانـــی
ڕەحمـــێ بمـــە ببـــە بکـــە ئـــەرزانـــی
بـــۆ کـــوردا پێـــل مـــەسعوود بـــارزانی

ئـــەم فـــەقیـــرین تـــو زەنگینـــی
ئـــەڤـــی شـــەڕی تـــو ڤـــەمرینـــی
هـــەمـــی مـــالا گـــریـــە و شـــینی
ئـــەڤـــێ جـــەنگـــێ ژ نـــاڤ هـــەلینـــی

یـــــا ئیلاهـــــی تـــــو قـــــادری
بـــۆ هـــەمـــی کـــارا تـــوی مـــاهری
تـــوپ[2] تـــەمـــرن ڤـــی ئـــاگری
دابێینـــــــە ڕێـــــــزا ئینســـــــانی

تـــو ل نـــاڤ کـــوردا ڕاکـــە کـــەربـــێ
خلاســـکە ئـــەڤـــێ حـــەربـــێ
بـــۆ وان خۆشـــکە ئـــەڤـــێ دەربـــێ
تـــــو خـــــالقێ مـــــە هـــــەمیـــــانی

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٥/٥/٦)ێ، ل (خەلێفان ـ پارێزگەها هەولێرێ) هاتیە ڤەهاندن.

(2) تو ب.

تو خالقی ئەم مەخلوقین
مە موکومە ئەڤرۆ یەقین
بلا بەسبین مە ڕاتەقین
چیا حەسکەین تو دێ ئینی

تو بۆ خاترا ڕۆژا ئینێ
تو خۆشبکە بۆ مە ژینێ
تو نەحەقا ڤەبرینێ
عەزابا خۆ ل سەر وان دانی

عەزابا وان تو دوو تاکە
تو حەمیمێ سەر وان داکە
ڤێ کوشتنێ ل ناڤ مە ڕاکە
د ڤەگەڕن کوردستانی

بلا مەسئوول باش بزانن
ئەڤ مللەتە نە گاڕانن
ب کەیفا خۆ پێل وان دانن
وان حسابکەن ب حەیوانی

ئەڤ مللەتە گەلەک وەستا
چو تشتێ باش نەهات دەستا
ژ غەریری کوشتن و خەستا
ب چاڤێت خۆ تو ێیت بینی

وە ژبیرکرن ئەنفالێت ڕەش
کانێ شەهید ئەو گولێت گەش
ئازادیا ل مە بوویە هەش
تێنە کوشتن ب ئەرزانی

## گەمیا پارتێ وی برە پێش[١]

هزار سلاڤ بۆ خودانێ خەنجەرێ[٢]
پارتەك وی دانا وەك بێدەرێ
من ناڤێ وی نڤیسی ل ڤێ دەفتەرێ
بۆ دیرۆکا کوردا هەتا مەحشەرێ

بناڤێ وی کورد سەربلندە هەمی
کەسێ ئەو ناڤ نینە ل ڤی سەردەمی
پارتا دیموکرات بۆ کوردا کرگەمی
یا بارزانی کری کەس نەکریە نەنو کەونە بەرێ

وی ناڤ مەلا مستەفا بارزانی یە
گەلەك خۆشە ل سەر ئەزمان و ساناهی یە
پارتا وی مەدرەسەیە و ئاڤاهی یە
وی کوردستان ڤەگرتن وەك کەمەرێ

وی دیروك پڕکر ژ باشییا
بچاندن[٣] پیلانێت بەعسییا
ئەو بوو ئالا بۆ کوردا هەمییا
یا د لڤ لڤیت ل هنداڤ دەڤەرێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٥/٥/٧)ێ، ل (خەلیفان ـ پارێزگەها هەولێرێ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) مەبەست مەلا مستەفا بارزانی یە.

(٣) بڕین.

وى ســـــەبـــر كێشـــا ســـــەبـــرەك درێـــــژ
گـــــەميـــا خـــــەبـــاتێ وى بـــــرە پـــــێش
دا ئـــــــەو ببرپـــــــت دەســـــــتێ پ قرێـــــژ
وى ديمـــــــــوكراتى ئينـــــــــا ڤێـــــــــرێ

خـــــو ڕاگـــــرت وەك چيـــا ل تـــــەنگاڤيـــا
وى خـــــەبـــاتكر بـــــۆ كـــــوردا هـــــەميـــا
ســـــەرێ دوژمنـــا چـــــەمانـــد و چـــــەميـــا
تايبـــــــەت پيلانـــــــا جـــــــەزائيـــــــرێ[1]

كـــــەريـــــم[2] و ســـــەلام و عـــــارف[3] و ســـــەدام
بـــــــــەرانبـــــــەر وى نـــــــەبـــــــوون زەلام
ســـــــــەدام بـــــــۆ خورتـــــا بـــــــۆ خـــــــولام
نوكـــــە مـــــەســـــعوودێ ل وى كـــــەت خورخـــــورێ

---

[1] ڕێككەفتنامەيا (ئەلجزائير) ل (٦)ى ئادارا سالا (١٩٧٥)ێ، دناڤبەرا عيراقێ و ئيرانێدا هاتبوو گرێدان.

[2] عەبدولكەريم قاسم.

[3] عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕەحمان عارف.

## عەدالەتا ژ ناڤ مە فڕی[1]

مە کوردستان ژێك ڤەچڕی
وەك کەلەخی ژێك دابڕی
عەدالەتا ژ ناڤ مە فڕی
لەوا عەلی تو شڕی

کوردستانا بوویە کەلەخ
حەرام خۆرا خۆ دایە ڕەخ
دا ئەو پارا بکەنە تەخ
وەك ئالفی ژبۆ مەڕی

دزی ئیرۆ ئاشکرایە
کەسێ نەکەت بێ بهایە
گەلی کوردا نە وەهایە
ئەرێ ما تو کوردێ زڕی

کی دێ دەردێ مە دەرمان کەت
ڤێ برینێ ژ بنی ساخکەت
ڤی کەلەخی ژ ئاخێ ڕاکەت
بکەت ئاشتی شوینا شەڕی

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٥/٥/٨)ێ، ل (گوندێ صارکێ ـ دۆلا بالیسانێ) هاتیە ڤەهاندن.

ئەڤی شەڕێ بێ شەرعیەت
بۆ کورادا بوویە عادەت
کەس ل دویڤ کەسێ بەرنادەت
وەك وان کەسا ئومێد بڕی

یا ل هێڤیا مە پەشیمانی
دێ کیڤە بەن ڤی تالانی
هرچ و گۆڕگێت گەل شڤانی
ئازادی چوو ڕابوو فڕی

ڤێ خەلەتیێ ڤەگەڕین
مللەتێ خۆ نەبرهینن
هەرن قورئانێ بخوینن
کا چت بێژت بۆ ڤی شەڕی

گوهێ خۆ بدەن (واعتصموا)
هەرن ڕاستیێ پێکڤە هەموو
لێ پێشمەرگە وەکو شەموو
سەر ڤان چیا بێ ئاگری

ئەڤان عەید و عەرەفاتا
هۆ ئەم کەتین ڤان لاتا
کی دێ دەت مە خەلاتا
ژ غەیری شینی و گری

## کا مەلا مستەفا[1]

ئەی پێشمەرگە تو عەزیزی
تووی وەك شڤانێ بەر پەزی
نەکارێ تەیە خرابی و دزی
ئیرۆ تو زدێ دوژمنێ ب هیزی

شەرم و عەیبە بۆ ناڤێ تە
ئەڤ ناڤێ پیس بهێتە سەر تە
تفەنگا بارزانییا ل دەڤ تە
قەبوول نەکە ناڤێ ڕزی

خەلکێ هوین خارن ب لۆما
بەحسێ وە دکەن د ناڤ کۆما
کوردێت ڕەڤن هەتا ڕۆما
ما کارێ پێشمەرگانە دزی

ما مایە ئیرۆ مالەك بێ شەهید
بۆ ڤێ ئاخێ نەبوویە بەرید
کا بارزانی کا شێخ سەعید[2]
هەتا ئەڤرۆ شینە و تازی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) شێخ سەعید پیران ل سالا (٩٢٥١)ێ، دژی حکوومەتا تورکیا شۆڕەش کر، ل هەمان سالێ هاتە سێدارەدان.

مـه دوعـا كـرن بـۆ حـوكمێ زاتـی
جـارەكـا دی بـێن نـاڤ وەلاتـی
ئـەڤـە تـو هـاتی ب خێـر هـاتی
مـامێ دزی تشـتێ بـڕازی

هـەچكـو چووینـە دەورا ئـەلمـانی
سـەیـارا د دزن كـەس پـێ نزانـی
دەر و پـەنجـەر بـرن ژ خـانی
هـەر وەكـی كـەوێ خـۆ لێـدای بـازی

مـا ئـەڤـەنـە قـانوون و یاسـا
تـو هـۆ د ڤـەشـێری شـالۆك و داسـا
تـو هـۆ د شـكێنی دوكـان و قاسـا
هێشـتا تـو وێـل بـن ئـەڤـرازی

ئـەڤـە عـەلـی بـۆ هـەوە گـۆت
چنكـو دلـی وی ب هـەوە سـۆت
هـەر تشـتا بـدزە بـدە ب پـەنقـەنۆت
پاشـی فایـدە ناكـەت قێـر و گـازی

## سەرۆکێ مە[1]

سـلاڤ ل سـەر تـە سـەرۆکـێ مـە
ڕۆناهیـا هـەر دوو چاڤێـت مـە
تـوی ڕەهبـەر و زەعیمـێ مـە
تـوی بهـارا بـەر دلـێ مـە

ئـەز تـە دبیـنم ئـەڤ سـاله
تـو بـۆ کـوردا بوویـە پالـە
دوژمنێـت مـە نالـە نالـە
ل بـەر سـەرۆکـێ پارتـا مـە

تـو هشـیار بـە دەم و گـاڤێ
ڕەحـەتـی پێنگاڤـا پـاڤێ
ڕێکـا تـە یـا کـەتـی ئـاڤێ
ئـەز دترسـم مـەسـعوودێ مـە

ڕێکـا تـە یـا کـەتـی دیجلـەی
زۆر پێویسـتە خـۆ هشـیارکەی
تـە بـاوەری ب حـافزی یـا هـەی
ئـەز دترسـم بیـت بـەلا مـە

عـەلـی پێشـمەرگـێ تـەیـە بـارزانی
ژبـۆ کـوردا هـۆزان دانـی
تـە پیـرۆز بیـت ئـەو مێرانـی
تـو هـەر بمینـێ سـەرۆکـێ مـە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (۱۹۹۷)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## مەزناهی بۆ خودی باشە[١]

گەلی کوردا گوهـ بدەن من
نابن دۆست نەیار و دوژمن

چونکی هەر ئیکی مرادەك یا هەی
کوردێ ب شەرەف خۆ هشیار کەی

نەیارا نەڤیت کورد ببن چ تشت
هەر ئیکێ یا دبن کەفشی ڤە خشت

فیجا من هیڤی ژ کوردا هەیە
خو بکەن ئێك بۆ مە فایدەیە

نە گوهـ دەن خۆش خۆشیکێت نەیارا
گاڤا بۆ هەلکەت دی هێن مە ب تەیارا

بلا بەس بیت برا کوژی
خۆ بکەن ئێك دا باش بژی

دوژمنا کورد کر چار پارچە
مە ب خۆ یا کری پینج پارچە

وەڵاهی شەرمە ژ مەڕا
دارێت دوژمنا د زکێ مەڕا

بۆچی ئەم ب نەورۆزی دخوین
ما بۆچییە گەر ئێك دوو نەگرین

عەلی مەزناهی بۆ خودێ باشە
باشە ئێکگرتن بۆ مە معاشە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٨/٢/٧)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

# پالێ پیشی[1]

ئـــەز نـــزانم حیکمـــەتـــێ
کـا بـۆچی کـەتـم خـەتـێ
کـی هـەیـە ڕێکـی ببـەتـێ
سـەر مـە ڕاکـەت زەحمـەتـی

مـن گـۆتێ ڕێچکـا مـن دورستە
مـــن حـــری تـــازە ڕستـە
مـن فکـرا خـۆ نـە گوهستـە
ئیـــرۆ کـــەتـــم قورنـــەتـــێ

مـن د گـۆت ئـەز بـاش کـوردم
ڕێکــــا پـــارتی نابــــەردم
هــا نێزیکــە ئــەز مـــردم
کـا کـی هـەیـە گوهـ دەتـێ

هـەتـا نوکـە مـن نـەدزانـی
دێ ل مــە بیــت بــارگرانی
ل مـە بـوو هـزرەت کـەرەك نـانی
ئـــەز چ بێـــژم هورمـــەتـــێ

پێشـمەرگێ سیە و حـەفت سـالا
نـەبیـت چـو ل نـاڤ هـەڤـالا
نـــابینم فرشـــك هـــەلالا
کـو بـدەت مـە فورسـەتـێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٨/٢/١٠) ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

پیـــر بـــووم چـــاڤ بوونـــه تـــاری
چـــــل ســــالا دژی نــــەیـــاری
بـــۆ كـــەس ناكـــەت هاریكـــاری
كـــاری ئیـــرۆ تشـــتەكـــی بـدەتـێ

چونكـــــو ئـــــەز بـــێ خـــــودانم
خـــەلـــك باگردانـــه و ئـــەز بـــانم
وه دیــــــاره ئــــــەز مێهڤـــــانم
پاكـــــا نــــانی خـــــەبـــــاتێ

ئـــــەز بوومــــــه پـــــالێ پیشــــی
ڕادامــــــــه نـــــــاڤ گلیشـــــی
گـــــۆت تــــو نابیــــه پیشــــی
قــــەبـــوول نـــابی ل حوكمـــەتـــێ

## ما كييه دل خۆش[1]

مـــن ل ژينـــا خـــۆ چ خۆشـــى نـــه ديتينـــه
هـــەرۆ خـــەم و قـــەهـــر و دەربـــەدەر و دوری نـــه
مـــن كـــەس نـــه ديـــت دلـــێ وی نـــه برينـــه
گـــەلـــەكـا ژ مـــه شـــەهيـدێت خـــۆ ديتينـــه

مـــا چـــەوا دلخـــۆش بيـــت ل ڤـــێ ژينـــێ
كـــو هـــەرۆ شـــەڕ بيـــت كوردســـتانێ
ب ســـەدا گونـــدێت هـــاتين بـــەردانـــێ
گـــەلـــى خۆشـــك و بـــرا مـــا ئـــەڤـــه ژينـــه

مـــن نـــه شـــەڤ خۆشـــه و نـــه رۆژ
مـــن دل نـــزاره و ســـڕ و ســـەرمايـــه بـــێ بـــەرۆژ
ئێكـــێ ببيـــنن ل كوردســـتانێ نـــه دلســـوز
هـــەمـــى ب كۆڤـــان و خـــەمـــن دل ب خوينـــه

هنـــدى مـــن ل بيـــره ڕەڤينـــه و دەربـــەدەری
كـــى دزانيـــت ڤـــى مللـــەتـــى چ هـــات ســـەری
هنـــد شـــەهيـــد بـــوون هنـــد بـــەرزه بـــوون هنـــد
پيـــرن كـــەفتينـــه قورنـــەتـا چ پرسيار لـــێ نينـــه

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (١٩٩٨/٢/١٩)ێ، ل (باتيفا - دەڤەرا گوليان) هاتيە ڤەهاندن.

ئـەڤـە سیهـ و حـەفـت سـالە ئـەز حـەرەسـم
پشـــت چـــەپـــەرا ژ ســـەرمـــادا د ڕەقســـم
چاڤ تاری بوون ژ خەوا ئەز تنێ مە بێ کەس
دا پرسـیارێ ل مـە بکـەت و مـە کـەس نینـە

ئـــەز پیـــر بـــووم و مـــە چـــاڤ مانـــە تـــاری
گـەلـۆ مـا هـەتـا کـەنگـی ل بـن ڤـی بـاری
عـــەلـــی مـــا تـــو دینـــێ یـــان تـــو هـــاری
بـــــەس کـــــوردینیێ ب خۆڤـــــە بشـــــدینە

هنـــدی تێمـــێ ئـــەڤ بـــارە ســـڤك نابیـــت
ئـــــەڤ بـــــارە ژ پشـــــتا مـــــن ڤـــــەنابیـــــت
ئـــەز ل هیڤیـــێ کوردســـتان ئـــازاد بیـــت
پـاش عـەلـی پشـتی هنگـی ڕەحـەت ڕوینـە

مـــن هیڤـــی ژ خـــودێ هـــەیـــە بهێتـــە نـــاڤ
چونکـــو مـــن ســـۆتن جـــەرگ و هنـــاڤ
مـە ل کوردسـتانێ شـاد کـەت ب ئـاڤ دەراڤ
دێ هـەرە شـاعر کـول و کوڤانـا ب ڕەڤینـە

# بێژن ئامین[1]

بـۆ جـەمـالا تـە چ بێـژم کوردسـتان
ئـەڤ شـەڕ و قـەڕقـەشـە نـە ڕاوەسـتان
ئـەگـەر دابـی بـاغێ گولسـتان
دا کـەو و بلبـل چێکـەن هێلینـا

سـەیرانـی گاڤـا تێنـە سـەیرانـێ
وەکو د بینن ڕەنگ و ڕووبارێت جانێ
دبێـژن جهـەك هـۆ کـانێ
مـەتحـەکارن بـۆ تـە هـەمـی هینـا

کەس ژ دیتنا تـە تێر نـەبوویە چ جار
تـو هـەمـی سهـ و سـەیران و دار و بـار
جـۆم و جـەلال کـانی و ڕووبـار
هـەوا هوینـە ئـاڤ تـەزینـە هاڤینـا

یـێ کوردسـتان دیتـی لـێ بوویە مـەرەق
بـاوەر دکـەت جـەنـەتـە ل دونیـا حـەق
چـو جهـ هوسـا نینـە ب ڕەونـەق
دێ ساخلەم بیت ژ هـەمی دەرد و برینا

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٨/٢/٢١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

کەسێ جهەك هۆ نینە خۆش و شرین
بـەحشـتە دەشـتە زۆزانـە سهـ ئافـەریـن
نەفت و پانزین تژینە ئەڤ جهێ زێڕین
تــژی قیــرە تــژی خۆیــە ل بــەهــدینا

هــەوارا خــۆ مــن بــر (رب العــالمین)
دەســـــتا بلندكـــەن بێـــژن ئـــامین
ل كوردســـــتانێ ڕەحـــــەت ڕویــــنن
دا ڕەحـەت بین ل سـەر تـەخـت و نقینـا

عەلی باش بوو ئەڤ دوعایە هۆ تە کر
بۆ کوردا بوو ئەو خەباتا هۆ تە کر
ئـەڤ هۆزانـە تـە هـۆ تـازە بـەلاڤ کـر
دا کـورد چێکـەن بـاغ و بـەسـاتینا

## ئەز بێ مرۆڤم[1]

ئـــەز ســـاخەكـــێ مـــری مـــە
ئـــەز ژ نـــەرمـــا هریـــێ مـــە
ئـــەز فێقـــی مـــە و تـــری مـــە
مخـــابن ئـــەز بـــێ مـــرۆڤم

ئـــەز چ بكـــەم بـــۆ مرۆڤكـــانێ
خـــلاس نـــەبـــوو ل كوردســـتانێ
ســـەرێ مـــن كـــەفتـــە گـــەرهـــانێ
هـــەرِۆ بـــێ نـــان و ئـــاڤم

خـــەباتكـــەر و نـــە خـــەباتكـــەر
نوكـــە وەك ئێـــك لـــێ هـــاتن
قـــەد مـــن نـــین چ مـــەفـــەر
نـــەشـــێم چ پێنگاڤـــا پـــاڤێم

ئـــەز نـــزانم بـــۆچی هۆیـــە
پارتیـــاتی نـــە هۆیـــە
دیـــارە هـــەر ئێكـــی بـــۆ خۆیـــە
لـــەورا ئـــەز بـــێ پـــەز و گـــۆڤم

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (٢٦/٢/١٩٩٨)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

بەرنامێ پارتی هۆ نینە
گوهێ کەسەکێ لێ نینە
لەو خەباتکەر مرینە
ئەز پیر بووم و بێ ناڤم

ل نك من ئاشکرا بوو
شۆڕەش نەبوو هەما بوو
لەوا موخلس ڤەما بوو
نزانم بۆچی ل ناڤم

عەلی بەس بکە گازندا
بەرێ خۆ بدە خراب گوندا
دەنگێ سەد پوڕ و کوندا
ئەز بێ نێچیر و ڕاڤم

## حەرام خور چوونە پێش[١]

ل ڤی عەمری دووماهی
کوردا کرم هەندەسە
برم دەورێ ب ساناهی
هەی هەوار مانە بەسە

هەی هەوار هەتا کەنگی
ئەز دی مینم ڤی ڕەنگی
ئەز چووبام ناڤ فرەنگی
دابێژن من ڤەهەسە

منێت برین زۆر زەحمەت
ئەڤە بووینە حکومەت
من نە برنە چو لەززەت
چنکو مەلا بێ کەسە

من خزمەتا هەی سە و حەفت سالا
مالا من نەبوویە وەك مالا
هەرۆ دەستێ من ڤالا
دائیم مەلا حەرەسە

یا ل من بوویە زك ئێش
حەرام خور ئەو چوونە پێش
ئەز بووم عەبدال و دەرویش
ئەڤ چ ئیقبالا تەرەسە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٨/٨/٢٠) ل بازێڕێ (سێمیلێ) هاتیە ڤەهاندن.

مـــا چكـــو ئـــەز بـــى خـــودانم
ئـــەز هـــەمـــى كـــارا دزانـــم
لــــــەوا هۆزانـــــا ددانــــــم
دا كـــورد ب حـــالى مـــە بحـــەســـە

هـــــەوارا خـــــۆ بــــبم كيــــرێ
هـــەر وەكـــى ئـــەز كـــەتـــيم بيـــرێ
كــــەس مــــە نائينيــــت بيــــرێ
مـــــن دوومـــــاهى ب ئـــــەساســـــە

# عەلی ڕۆندکا ب وەرینە[1]

بەرێ خۆ بدەن من و ڤی عەمری
یا ب سەر من داهاتی پیری
ڕهـ سپیبوون بوونە هری
ماشنوو وەختێ من و دەوانە

چاڤێت من یێت بووینە تاری
یا ل من بوویە ئێڤاری
نەشێن هەلگرین ڤی باری
نوکە دورا خورتانە

ئەی هەڤالێت پڕ بەرێز
بۆ من نەمانە چو هێز
من ددان نەماینە ڕێز
نزانم ئەڤ چ زەمانە

دلێ کەسێ ب مەڤە نینە
ب خودێ ئەڤە نەچو ژینە
عەلی ڕۆندکا ب وەرینە
یێ مرۆڤ نەبن یێ بێ خودانە

ئەرێ ما کەسێ نەمایە مرووەت
بێژن مەلا نەمایە تاقەت
یێ پیر بووی و داکەت
وەڵڵا ئەڤە نە وژدانە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٨/٨/٢٥)ێ، ل بازێڕێ (سێمێلێ) هاتیە ڤەهاندن.

کـــەس نـــەمایـــە ژ خـــودێ بترســـیت
ل حـــــالێ مـــــە بپرســــــیت
مـــەلا ژ ڤـــی حـــالی ڤـــەڕسیت
بێـــژن مـــافێ مـــەلای بیندانـــە

ئـــەڤـــە چـــل ســـاله ئـــەز حزبـــی
یـــێ بـــیم ســـوفی خـــودان تزبـــی
هـــــەر وەك مرۆڤـــــێ زیزبـــــی
هـــەڤـــالا ژ مـــــن نـــــەڤیانـــە

ئـــــەز نـــــزانم نوکـــــە بـــــۆچی
کەس نەشێت بۆ من چێکەت سویچی
مـــە ژ خـــەمـــا لـــەش قـــوڕمچی
چنکـــــو یـــــێ بـــــێ خودانـــــە

گـــــەلـــــی دۆســـــت و پســـــماما
مـــــــن و دەورا ئـــــــەلغامـــــــا
خـــەلکێـــت بێژیـــت مـــن مامـــا
ژیـــــێ مـــــن بـــــەرەڤ نـــــەمانـــە

ئـــــەز و ئیـــــرۆ هـــــەنـــــدەســـــە
مـــال هێڤیـــا منـــه مـــەدرەســـە
بـــەلـــێ مـــەلایـــێ[1] بـــێ کـــەســـە
مـــن شـــنوی ل شـــۆڕەشـــێ هـــەودانـــە

---

[1] مەلا عەلی، هەلبەستڤانێ ڤێ دیوانێ.

## سەیارا جام تاری[1]

ئەی موخلسێ تەمەعکار
تە مالێ شەهیدا خار
تە ژبیرکر ئەهد و قرار
ڤێت تە قەبوول نەك ژار

هەژارا شۆڕەشا کری
وان یا کری بەرگری
ئیرۆ تە هێلان مری
هەمی مافی وی تە خار

ئیرۆ تە یێن هەین مودێل
خودان قەسر و ترومبێل
تەلەفزیون و بێ تێل
زکێ تە هۆ بۆ خرار[2]

تە گۆت ئەز پارتی مە
موخلسێ ڤێ جهی مە
تە نە گۆت خودانێ پاری مە
تو بۆ پارتی بووی نەیار

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩) ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] خرار، تێڕا بچویك واتە ڕەخەکێ تێڕێ.

خودانێ سەیارا جام تاری
بۆ کوردا نێ تو نەیاری
مادەم تو خودانێ پاری
تو بوی گورگەکی هار

عەلی لگەل تە دەعوەدارە
ئەوی ل حەقی پسیارە
ڕاستی ل نك وی دیارە
هەردەم بۆ خۆ کریە کار

# سندوق کرین[١]

ڕێبازا پارتی ل کویرێ
کاربدەست ل کویرێ
هەمی خال چوون ژ بیرێ
ئەم برین سەر بیرێ

بەهرا پتر خۆ لادا
وان ب لەزەتا خۆ بادا
وان مالا پارتی ڕادا
نزان وان بر کیرێ

پارتی دانا بوو ئەساس
بۆ مرۆڤی خۆ نیاس
دا بۆ کوردا بیت پاس
دا نەکەڤن زنجیرێ

وان بیرکرن شەفێت تاری
پیشمەرگە ل بەر نەیاری
وان پاری کر دوو پاری
وان چا بۆ کەتکا هەژیرێ

ئەوان شەڤێت تەقن و تۆق
ناڤ چەپەرا چاڤ بلۆق
مەسئولا کرین سندۆق
دا تژی کەن دولارێ

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩) ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

پانزینخانـــــــه و دوكـــــــان
بـــــەهــــرا پتــــر وان دانــــان
پیشـــمەرگـــە هـــێلان بـــێ نــان
هـــــەمــــی ڕوینشــــتن خــــارێ

ئـــەرێ ئــــەڤـــــەیـــە ڕێبــــاز
بــــۆ دوژمنـــــا چێكـــــر بـــاز
تـــو هـــۆ نـــە كـــوردی شـــەڕ خـــاز
ژ خــــەلـــەتیـــا خــــۆ وەری خــــارێ

عــــەلـــی تـــــو بكــــە گـــــری
ل ســــەر خـــاترا لــــەشــــكەری
باریكــــــــەلا عــــــــەمفــــــری
لـــــــەشــــــكەری دەورێ بــــــارێ

## بەهشتە[١]

کوردستان وەك بەهشتە
تژی چیا و تژی دەشتە
ژ مەعدەنا را مشتە
لەو خوین مە ل سەر ڕشتە

خۆزی تازە ئازاد بیا
گوندی خراب ئاڤا بیا
ژ جەنگ و شەڕا خالس بیا
خرابا خۆشی لێ نەهشتە

هەمی پێکڤە هاڤینگەهە
هەوا سارە هەمی سهە
ئاوازێت خۆش تێنەگەهە
وەك دیلانا بەر و پشتە

چیا گەلەك سەبرینن
چاخی کەو لێ د خوینن
خەما ژ دلا دەرتینن
تو دێ بێژی خۆش تشتە

نێرگزین کەفنە لاتا
یا خوە د هەژینن تاتا
ئینن گەلەك وەلاتا
گول نەخوین چەندا قشتە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

ڕەبـــــەنـــــوك و بنـــــەفشـــــۆك
سوســـن و بـــەیبـــوون و گیـــانۆك
وەم دخـــوینن کـــەو پـــەپـــوك
خۆشـــی هـــەمـــا لـــی مشـــتە

وەرن گییاییێـــــــــت خـــــــارنێ
لۆشـــــك و ســـــۆریازە ل دنـــــێ
کـــــەنگـــــر و قـــــوڕاد ب تنـــــێ
بخـــۆن دگـــەل نـــان و گوشـــتە

بـــــۆ زیـــــك ئـــــەڤـــــە ڕێبـــــاز
بـــۆ ڕەنگـــی ســـۆر ئـــەڤـــە ڕێنـــاس
بـــۆ ڕەنگیـــت گیـــا ئـــەز بـــەرنیـــاس
بیـــــك و بیـــــزا سۆرۆشـــــتە

کـــاریی بخـــۆ کاریـــا کـــەلـــی
بـــاش بخـــەســـین دا نـــە هـــەلـــی
ئـــەو دوژمنـــی مـــاری خـــەلـــی
بـــۆ وی کـــەســـی تێگـــەهشـــتە

عـــەلـــی تـــە چـــەوا هـــۆ زانـــی
کـــاری باشـــە بـــــۆ دەرمـــانی
مـــــە ژ مـــــە زنایـــــا زانـــــی
گـــەلـــەك باشـــە ئـــەڤ تشـــتە

## کورد ئاڤا ناکەن گوندا[1]

گەلی کوردا گەلی مەردا
بەس بڕەڤن هەڕن ئەردا
بەس خۆ پاڤین کول و دەردا
بۆ وەلاتی خۆ بکەن فیدا

ژار و فەقیر دناڤ چەپەرا
پا کا کورێت دزیکەرا
هەرێ لێکددەن مال و پەرا
وانا ل قەسرا پالڤەدا

ئەڤ مالە نە مالێ تە بوو
بەلکو پاری دزییا تە بوو
ئەڤ پارە نە ڕاتبی تە بوو
وە خوار ماڤێ شەهیدا

وەك تو هاتی کوردستانێ
تە نەبوو حەقێ نانێ
ئەڤرۆ خودان دکانێ
تە پارتاتی ل دەردا

تو ب چ ڕوی دبێژی ئەز کوردم
هەژارێ دبێژیت ئەز مردم
قەد نەبێژە ئەز کوردم
دی تە ڕاکیشن هودا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩) ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

وه د گــــۆت ئـــــهم تێگــــههشـــتینه
وه بــــــهر ل فــــــهقیــــرا نینــــــه
بـــــــــهس مـــــــرادا وه ژینــــــــه
وه یـــــا خـــــۆ دای پشـــــت پــــــهردا

هـــــهر گوشــــتی بکـــــره و بینـــــه
ســــهر تــــهبـــاخێ بکـــــهلینــــه
تـــــــهنشــــــت خـــــاتینێ ڕوینـــــــه
وه دیمــــــــــــوکراتی ل کیــــــــــدا

عـــــهلـــی بـــــهس بکــــه گازنــــدا
کـــــورد ئاڤـــــا ناکـــــهن گونــــدا
چونکــــــو خیانــــــهتــــا د دلـــــدا
لــــــهومـــــا هـــــهر ژار مـــــان هنــــدا

## دزیا وان بەلا وا بوو[1]

دنیا ل مە تاری بوو

ژبەر ڤان کاربدەستا

پارتیاتی نەهۆ بوو

مافی مە خار ژ قەستا

رێکخستن وان ژبیرکر

مللەت هەمی ما ئالۆز

ل کارێ خۆ تەخسیرکر

کر سەیارە کەرێ بۆز

پارتی چێکر بارزانی

دا ل کوردا بکەت ئەرزانی

کادرا ب خۆ باش زانی

کا دێ چەوا خۆن نانی

بەرێ وان کەت حەرامی

خەلك سست کر ب عامی

فایدە نادەت محامی

خۆ بەری[2] کەن تەمامی

ب سەرێ وان فایدە ناکەت

دی ڤی مالی ئەدا کەت

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩) ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] بێ گونەه.

ئەگەر دی خۆ فەناکەت

بۆ کوردینیێ ژی ناکەت

ژیێ سەرۆك درێژ بیت

وەکی ب ڤی کاری ڕابووی

کار هەر دێ وەکی وی بیت

دی زفڕینت ئەوا چووی

بوون خائینێت ئاشکەرا

ل ناڤ ڕێزێت شۆڕەشێ

پا دی چکەن کابرا

بلا خوە وەرکەن هەشێ

عەلی خۆ عاجز نەکە

سەرۆك ب کاری ڕابوو

ڕوینە خارێ دەینەکە

دزیا وان بەلا وا بوو

# کوردینی بۆ وەك هەڤشی[1]

کا کوردی ڕاست و دورستی
وەك ڕێسێ بارزانی ڕستی

کا کوردێ کورد پەرەستی
ئەوە یێن خۆ نە گوهاستی

خیانەت و ئیخلاسی
هەر دوو پێکڤە ناژین

ئاخ بۆ کوردێ بێ ئەساس
بۆچی خۆ کرە پارتی

دیارە وی بۆ حیلە بوو
فایدە نادەت وەلاتی

خۆ کر گورکی شۆڕەشێ
دا بخۆت مافی هەژارا

دی ڕۆندك کەڤ کوشێ
هەر دی مینت دا کەتی

فەرزە بۆ کەسی پارتی
سەبرەکا دویر و درێژ

وەك بەرەکی خۆروستی
دی فایدە دەت وەلاتی

ل سالا چل و حەفتێ
بارزانی چوو ناڤ ڕۆسی

کوردینی تو دا کەتێ
بوویە تاری ل وەلاتی

دگەل پێنج سەد هەڤالا
چوون گوهـ نەدا عەیلا

مال وێرێ یازدە سالا
پاشی گەڕا وەلاتی

ل سالا پینچی و هەشتێ
هاتە ڤە کوردستانێ

عالەم گەلەك گەهشتێ
هەمی بوونە ڤە پارتی

بلا کورد هەمی بزانن
بارزانیە بابێ وان

بنەمالا شێرانن
نانێ کوردا وی پاتی

عەلی تە ئاشکرا کر
هەچیا خرابا کری

تە پەردە سەر وا ڕاکر
لەوا هۆزان باش هاتی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## خوينا شەهيدا ل سەر ئاخێ مەهی[(١)]

ڕەحمەت ل وە بيت گەلی شەهيدا
هوين چوون ڕەحمەتێ وەكی عەگيدا

هوين يێل بيرا مە ب شەڤ و ڕۆژ
وە ژبير ناكەت چ كوردێ دلسۆژ

دارا ئازادیێ هەوە يا چاندی
وە خوينا خۆ يا لێ ڕەشاندی

ئەڤرۆ ئەو دارا هاتيە بەری
ڕێبازا وە دێ بينە سەری

كاوەیێ ئاسنگەر باپيرێ وەیە
بارزانیێ مەزن سەركێشێ وەیە

مافێ كوردسانێ وە ل سەر خۆ راكر
وە ڕوحا شرين سەر وێ فەنا كر

دەولەت سەرێ وە دێ كەين نەورۆزێ
چ جار ژبير ناكەين وێ كەڤنە دوزێ

بهارە بيست و ئێكی ئاداری
هەر دێ پێشمەرگە بين نا ڕوينين خاری

شەهيدا ژبير ناكەين نە مێر و نە ژنا
دێ بينە تير بۆ دلێ دوژمنا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٩)ێ، ل (باتيفا ـ دەڤەرا گوليان) هاتيە ڤەهاندن.

ڤێــت ئـــەم هـــەمــی ببینـــە كـــاوە
كـــوردێن ئێـــك پـــا چـــەنـــد لاوە

بـلا ڕابیـت ل ســەر مـە غـەدر و خیانـەت
مـا گوننـەهـە كـورد بـبن حوكمـەت

ئـــەم كـــورد نێزیكـــی چـــل ملیوونـــا
ئـــەمێـــت مـــاین بنـدەســتێ مـــەلعوونـــا

ڕابـــن ســـەر خـــۆ خـــۆ ڤـــەهـــەژیـــنن
دوژمنێــــــت خــــۆ ژ خــــۆ ب ڕەڤیـــــنن

بـــەس كـــەیفـــا دوژمنـــا ب خـــۆ بیـــنن
دا تـــــازە ل ســـــەر ئـاخـــا خـــۆ ڕویـــنن

دوژمنـــێ كـــوردا ل بـــەر وان ڤـــەنایـــە
بـەس ئێـك دوو بكـوژن نـێ ئـەو فـەنایـە

مـا هـەتـا كـەنگـی تـو تێناگـەهـی
خوینـا شـەهیـدا ل سـەر ئـاخێ مـەهـی

ئـــەم كوردێـــت مـــاین و فـــەلـــەســـتین
مــــا بـــۆچی ئـــــەم خــــاف و ســـــتین

بـــلا كـــورد پێكڤـــە ڕویـــنن خـــارێ
بـــەس مـــە د كـــەڤـرا دا پاڤێنـــە خـــارێ

بـــۆ خـــۆ پێكڤـــە بكـــەن حێـــوارێ
ب گفتوگـــو دێ گـــەهـــن قـــەرارێ

خـــۆ هشـــیاركەن گـــەلـــی تـــۆلازا
گوهـــــــ نـــــەدە چ حیلـــــە بـــــازا

خـــۆ هشـــيار كـــەن بـــاش و بـــاش
بـەس خـۆ ژ كوردســتانێ بـدەنـە پـاش

فكـــرا هـــەوە يـــا كـــەتـــى ســـەر خـــارج
مـــا هـــەوە ديتـــە مـــرۆڤ بوويـــە هـــرچ

كوردســـــتانا مـــــە جـــــەننـــــەتـــــە
ژيانــــــا وێ بـــــــێ مننــــــەتـــــە

هلـــــۆن هـــــەلـــــده زەنـــــد و بازنـــــا
بشـــــــــكێنن دفنـــــــا دوژمنـــــــا

كـــــوردن هـــــەمـــــى وەكـــــى شـــــێرا
كوردســـتانێ پێژانكـــه وەكـــى مێـــرا

پێغـــەمبـــەرێـــت هـــاتين كوردســـتانێ
وەكـــى نـــوح هـــاتى كـــاتێ[1] توفـــانێ

گـــەمـــى كـــەت ســـەر چيـــايێ جـــودى
مـــــا ئـــــەز چ بێـــــژم بـــــۆ وه ئێـــــدى

گوهـــ بـــدەن ســـەرۆك مـــەســـعوودى
نـــــا بينـــــين وەك وى كـــــەســـــێ دى

ل دوماهيكـــــــا ڤـــــــێ هـــــــۆزانێ
ڕەحمـــــــــەت وەكـــــــــى بـــــــــارانێ

ل ســـــەر شـــــەهيـــــدێت كـــــوردانێ
و عـــــــەگيـــــــدێت كوردســـــــتانێ

---

(۱) دەمێ.

## کوردستانە بویکا جیهانێ[1]

ئاخ کوردستان چ خۆشە
خودان کەهنی و ڕووبارین بۆشە
ئەی کورد هشیار بە نەفرۆشە
دا تێدا بژین ب سەر فیرازی

کوردستان بەهشتەکا ئاشکرایە
چ تشتێ تە بڤێت ئەوی تێدایە
وی ناڤ بلندە وەك ئالایە
دەشت و زۆزان پڕ ئاڤا تەزی

هەمی جهـ لێ هاڤینگەهن
خۆ هشیارکەن باش تێبگەهن
هەمی چییانە و خۆش بنگەهن
دەخل و دانا بچینە و چیکە ڕەزی

کوردستانە بووکا جیهانێ
نە هەر کەسێ خواست تو بێژی هانی
پاشی بزانە دێ چی نەمانێ
پاشی دێ ل کویرێ چینێ وەرزی

جهێت هۆ ب دەستا ناکەڤن
تەعنێت دوژمنا ب تە دکەڤن
دێ پەشیمان بی ل دەوسا کەڤن
دێ ل تە بیت هزرەت ماستێ پەزی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٩/٢/٢٢) ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

ڤێـت هــەمــی لــێ بــبن زێــرەڤــان
ڤێـت هــەر هــەبــن شــڤان و گاڤــان
گاڤـا دوژمنــەك هــات ببن بــەرەڤـان
بــۆ کارێــت هــۆ تــو ســەرفــەرازی

کوردســـتان مشـــتە ژ مـــەعـــدەنــا
نــەفــت و کــومرِ و خــۆیی بــەتــەنـا
ژ غـەیری زیـرِی و زیڤـا و کلـێ چاڤـا
قیــر و کبریــت و ئــەلمــاس و مــازی

عـــەلـــی بـــەس ســـیفەتـــا بێـــژە
کـــورد هشـــیارە نـــە کـــەرِ و گێـــژە
مرۆڤـــی بـــێ خاســـیەت بـــێ ڤـــەرِێـــژە
تـــو هـــۆ ل کـــوردا دکـــەی گـــازی

# جهێ شەهیدێن کوردانە[1]

کوردستان ناڤێ تە چەند شرینە
دول و نهال تەژی کانینە
تژی ل سەر شڤان و بێرینە
کەڤر و دار تژی هنگڤینە

ڕووبار و کانی د ناڤ تە د مەشن
کەیف و سەیران د ناڤ تە دخوەشن
بێری و شڤان وەك سەرخوەشن
چ جهەك خەم ڕەڤینە

جهێ کەیف و سەمانە
جهێ مەرد و مێرانە[2]
جهێ شەهیدێت کوردانە
ل بەر خۆشیا وێ خوین ل سەر ڕشتینە

وان ئازادی یا لێ چاندی
وان دوژمنێ ڕەڤاندی
پێشمەرگێت وەك ڕوبادی
هەرە تێدانە نا ڕوینە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٠/٥/١٠)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: ڤان سیبەرا و سهو هەوا
خۆشە دەنگێ بلبل و کەوا.

ئەڤ چ حالە ل كومەلگەها
هەمى تۆزە و هشك و زوها
هەرن گوندا ل بەر وان سها
دار و بارێت فێقى بچینە

هەڕن گوندا خودانكەن پەزى
تێر بخۆن و ڤەخون ئاڤا تەزى
زەڤیا شینكەن چێكەن ڕەزى
گویز و باهیف وەك مەعاشینە

مازى و كەزان و بەرى
هرمیك و گوهیشك و ترى
وە هۆ زوى ژبیرا خۆ برى
عەلى ژبەر وە قێر گرینە

## بارزانی[١]

بارزانی تە دیروك نەخشاند
بارزانی تە دنیا هەژاند
بارزانی تە دوژمن ڕەفاند
بارزانی تە مافێ كوردا هەلاند

بارزانی تو بوویێ تەیرێ باز
تە هەلچنین نشیف و ئەڤراز
بارزانی تە بو كوردا دانا ڕێباز
بارزانی تە دوژمن شەلاند

بارزانی تە سیاسەت ڕەشاند
بارزانی تە ل هەر چار پارچا ڕەشاند
بارزانی تە زانین وەشاند
بارزانی تە دوژمن قەلاند

بارزانی تە شۆڕەش ڕاكرن
بارزانی تە دوژمن دەركرن
بارزانی تە كورد زاناكرن
بارزانی تە دانان ڕێباز و بەند

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٠/٥/١٢) ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## بۆ كوردستان خۆ كر فيدا بارزانى[١]

بۆ كوردستان ئەڤيندارم
ژ دويريا وێ قەرارم
ژبۆ وێ حەرەسەك هارم
ژ كوردستانێ نەبێ بارم

كوردستان گەلەك خۆشە
خودانا ڕووبارێت بۆشە
گەنجينەكا پەردە پۆشە
حەژێكەرێ سيبەرێت سارم

كوردستان زۆزانە و فەڕاشينە
گەلەك خۆشە گەلەك هينە
كەسێ جهەك هوسا نينە
ژبۆ وێ دل بريندارم

چێ تشتێ خۆش تو ژێ بخازى
يێ لێ هەى و تو ژێ ڕازى
خۆش دەرمانن بەرۆ و مازى
ڤێت ب پارێزم ئەز نەچارم

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتى (٢٠٠٠/١١/٥)ێ، ل (باتيفا - دەڤەرا گوليان) هاتيە ڤەهاندن.

نـــــاڤێ وێ شـــــرینە و جانــــە

نـــــاڤێ وێ کوردســــــتانە

جهــــــ و ئاخـــــا کوردانــــە

یــێ کـــەیــف خۆشـــم وەك بهـــارم

جهـــەك خۆشـــە مێـــرگ و کـــانی

خـــۆش دەرمانــــە بـــۆ ئینســـــانی

خـــۆ کـــر فیـــدا بـــۆ وێ بـــارزانی

بـــــۆ نـــــەیـــــارا ئـــــەز پیـــــژانم

## خارنا ئەفنديا[1]

بهـــار خـــەملـــى ب بـــارانێ
خۆشـى كـە فتـە دەشـت و چييـا
نـــەخاســـمە ل كوردســـتانێ
هـــەمـى تشـت كـەت خۆشــييا

دار و بـــار بوونـــە خيڤـــەت
بـــۆ لـــەزەتـــا ئينســـانا
بهـــار هۆيـــە حـــەقيقـــەت
هـــەمـــى خـــودان ڕوحـــا ڤييـــا

زتانـــا ســـڕ و ســـەڕمـــا
ڕەڤـــى ســـەرمـــە دا بـــوورى
نـــەخۆشـــى چـــوو چـــو نـــەمـــا
تـــازە شـــين بـــوون دەخـــل و گييـــا

هـــەمـى جهــ بووينـە هاڤينگـەهــ
بـــۆ مرۆڤـــا و حـــە يوانـــا
چـــەنـــد خۆشـــە ئـــەو مـــودەهــ
نـــە خاســـمە ل دەرگـــەلييـــا

كوليلـــك ســـۆر و زەر بـــوون
ل نـــــزار و بـــــەرۆژا
كـــەيـف و ســـەيران زيـــدە بـــوون
بـــن داريـــت ڤـــان بـــەڕوييـــا

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتى (٢٠٠١/٣/٢٠) ل (باتيفا ـ دەڤەرا گوليان) هاتيە ڤەهاندن.

شـــين بـــوون ڕێڤـــاس و كڤـــارك
كـــو ژ گوشـــتى خۆشـــترن
كـــورۆڤرِ بـــوون وەك تـــرارەك
دێ كـــرى ب ســـەد ڕپييـــا

هـــەكـــدان و بيـــك و بێـــزا
ل زۆزان و هنبێـــــــــــــزا
چـــو گيـــا ناهێتـــە ڕێـــزا
جهـــێ وان لبـــەر كـــەڤييـــا

لويشـــك و ترِشـــوك و ســـۆرياز
كـــەنگـــر و ســـيرك و پيڤـــاز
ئـــەو خـــۆش گييانـــە دلخـــواز
ئـــەون خارنـــا ئـــەڤـــەنـــدييا

نـــەوعێـــت گيـــا ب هـــەزارا
وەكـــى شـــين دبـــن ل بهـــارا
دەرمـــــانن بـــــۆ برينـــــدارا
وەك دوختورێـــت ئـــەجنـــەبييـــا[1]

---

[1] بيانيان.

# (سبحان الله) كوردستان چ خۆشه[1]

(سبحان الله) كوردستان چ خۆشه
خاسمه ل چاخێ بهارا
(الحمدالله) كورد زۆر بۆشه
كور بوون چاڤێت نەیارا

ئاخا وێ ئاخەك زێڕینه
ژبلی كوردا كەسێ ماف تێدا نینه
تژی تێدا نەفط[2] و پانزینه
خەملا وێ جانه ب داروبارا

شەهید خوینا خوه یا ڕشتی سەر
ئازادی وان ڕۆنكر وەك فەنەر
هیڤیدارین كورد ببن ئێك خەبەر
كوردستان دێ تەژی بیت ژ پارا

كوردستانێ بپارێزن
گەلەك پارا لێب مەزێخن
ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ڤەگوهێزن
بگرسینن[3] خرابا و دزیكەرا

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢/٥/٢٠٠١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیه ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیه هەلبژارتن.

(2) نەفت، گاز.

(3) ب ترسینن.

دوو هـزار و حـەفسـەد[1] و ئێـك سـاله
مـــالا كـــوردا نـــەخـــۆش مالـــه
نوكـه ئـەڤ حالـه بـۆ وان حـەلالـه
دوژمـــــن ب وان وەكــــى مــــارا

گاڤـا هـەلكـەت دێ ب وان ڤـەدەت
گاڤـــا وا ديـــت بخـــۆ فرســـەت
ئـــەو ب كـــوردا نابـــەن ڕەحمـــەت
دێ بـــەلاڤ بـــن وەكـــى جـــارا

ڕوبـــاد هۆزانـــا تـــه خـــۆش هۆزانـــه
نـــەســـحەتـــا تـــه بـــۆ هـــەمانـــه
نـــــاڤێ وەلاتـــــى كوردســـــتانه
ڤێـــت گوهـــ بـــدەيـــن قـــەرارا

[1] حەفت سەد.

## ئەڤینی[1]

دلبـــەری ئیـــرۆ ســـەحـــەر
ئـــەڤ چ جلـــن تـــە کرنـــە بـــەر
هلـۆ شـل و مـل ژ قـەسـرێ تێیـە دەر
پیـــر و تـــولاز ەیـــلان بـــی مـــەفـــەر

ماتـــە نـــەدزانـــی تـــو هنـــدە جـــانی
بـــۆچی دەرکـــەفتـــی ژ دەرێ خـــانی
تـــە عاقـــل نـــەهـــێلا بـــۆ ئینســـانی
نێزیکـــە شـێـخ و مـــەلابـــن دەر ب دەر

ســـوبحان ژ شـــاهێ کـــەرەمـــێ
چ جـــانی دا بـــر هـــۆ قـــەلـــەمـــێ
وی ئـــاگر بـــەردا عالـــەمـــێ
دل هـــەمـــی کـــرن کـــەر ب کـــەر

عاشـق نـزانن چـەوا ل مـال بزڤـڕن
نازرپـــــت وێـــــل دورات پـــــڕن
هـــا نێزیکـــە ژ کـــەیفـــا بفـــڕن
ژبـــەر نازکـــا حـــووری قـــەمـــەر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠١/٦/٢٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

وەكـــى تێتـــە بـــەر پـــەنچـــەرا

دلا ددەت بـــــەر خـــــەنجـــــەرا

د میـــــــــــنن وەك دەر ب دەرا

دێ میـــنن هشـــك دێ بنـــە بـــەر

مـــا تـــو ژ خـــودێ نـــا ترســـی

تـــە عـــالم ئێخســـت ڤـــی كراســـی

هـــەمـــی مـــان ڕویـــس و برســـی

عیشـــقا ل وان كـــر ئـــەســـەر

عاشـــق زۆرن مـــەعشـــووقە ئێـــك

نـــزانم دێ چـــەوا هێـــت بـــەرێـــك

یا ل مە بەرزە بووی ئەڤ كۆرە ڕێك

تـە ل وان زێـدەكرن دەرد و كـەسـەر

ئـەز نـزانم تـو هـەیڤـی یـان ڕۆژی

تـــو عاشـــقا هۆســـا د كـــۆژی

چووینـــە تێكـــرا وەكـــی ڕویـــژی

ماینـــە هـــەژار و بـــێ مـــەفـــەر

تـــو وەك ســـتێرا گـــەلاڤێـــژی

تـــو هـــۆ برقـــا د هـــەلاڤێـــژی

تێرێـــت عـــەشـــقێ تـــو د هـــاڤێژی

عاشـــق هـــەمـــی تـــە كرنـــە دەر

## قازی[1] خۆ كر قوربان[2]

بـلا ڕەڤ بـەس بیـت گـەلـی كـوردا
پێـــك وەرن ئاڤاكــــەن گونــــدا
هــەتــا كــەنگــی ب مینــین هنــدا
ئەم دەوبەدەر بین خـەلـك چیكـەن فرندا

دوو هـــزار حـــەفــت ســـەد ســـالە
مـــالا كـــوردا نـــە خـــۆش مالـــە
ئـــەی گـــەلـــۆ مـــا ئـــەڤـــە حالـــە
كـــورد بــــەلاڤ بــــن ل عــــەردا

دێ بـەســە بـۆ خـۆ بگـرن عبـرەتـا
بـەس مشـەخـت بـن نـاڤ دەولـەتـا
بـــاش گوهـــ بـــدەن ڤـــان شـــیرەتـــا
دا هــــەلكـــــەن شـــــەمـــال و فنـــدا

باشـــە كـــورد پێـــك بـــێن هـــەمـــی
دێ وان هـــەبـــن فرۆكـــە و گـــەمـــی
دا ب ئـــازادی شـــین كـــەن چـــەمـــی
خرابــــە شــــەڕ دێ بــــن وەنــــدا

---

(١) قازی مەحەممەد، دامەزرێنەرێ كۆمارا كوردستان(١٩٤٦)ێ، بوو ، ل (٣١ ئاداری ١٩٤٧)ێ، ل مهابادێ هاتە سێدارەدان.

(٢) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠١/٦/٢٩)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

دوژمنـــا کـــەیـــف و ســـەیرانـــە
کـــارێ وان فـــەســـاد و پیلانـــە
دا هـــەر بـــێ خـــودان بیـــت کوردســـتانە
داکـــو کـــورد بـــەلاڤ بـــبن و هنـــدا

کوردســـتان ئێکـــە یـــا بـــێ پارچـــە
هـــەڕۆ ل ســـەر مـــە خـــەرج و خـــەراجـــە
بـــۆچی کـــەس ژ کـــوردا بیـــت خاجـــە
هـــەر ل پـــاش ڤـــەماینـــە و ل بنـــدا

بیـــنن بیـــرا خـــۆ ســـالا چـــل و شـــەشـــێ
کـــا چ هـــات ســـەرێ شـــۆڕەشـــێ
ل مـــەیـــدانا چـــار چـــرا ل حـــەوشـــێ
قـــازی خـــۆ کـــر قوربـــان بـــۆ کـــوردا

## خێرا خودێ[١]

پارتی یا بێ خێرا خودێ
ب شەڤ و ڕۆژ پارا ددێ
ئیرۆ کەس نا کەت کەدێ
هەمی خودان معاشن

معاشێ وان مسوگەرە
ئێک دبێژت ئێکێ وەرە
تو ل مال چتکەی کەرکەرە
چوونا ڕەبیا زۆر باشن

بخۆ و ڤەخۆ و بنڤە
جار و بارا ڕابە ژ قونڤە
گەر تو ترسای هەرە د گونڤە[٢]
پێشمەرگێت هۆسا د باشن

دوو پێشمەرگە سێ قونتەرات
گاڤا جەردێ ب سەردا هات
دێچایەکی بۆ کەن خەلات
دێ بێژیت چ هشیارن نە شاشن

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠١/٧/٩)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] گوندیڤە.

گاڤا جەردێ ب دەست چوونی کر
ئامر فەوج دی بێژیت من حیلە لێکر
باشە مە شۆلا خۆ باش چێکر
جەردە هەبلە تراشن

## کوردستان کەربەلایە[١]

کوردستان مە کەربەلایە
مە ب هزارا شەهید لێ دایە
هەمی چەپەر و قەلایە
کورد بۆ دوژمنا بەلایە

نا هێلیت دوژمن لی بژیت
ناهێلیت فڕەك ئاڤێ هەل مژیت
دی وان کەندەرێ و دێ کوژیت
دی ل وان کەت هەیبەت و تایە

چاڤێت نەیارا هەمیا لێ د زلن
برینێت وان زۆر کۆر و کولن
چیا تەژی کەو و بلبلن
هەر ئێك ژ وان ب سەدایە

عەلی هۆزانێت تە د کورتن
بەلێت ڕامانید خورتن
ئەڤە ڕاستییە نە ڤرتن[٢]
هۆزان هۆسا ب بهایە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠١/٧/١٩)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) درەو.

## هێڤیا من ژ باژێرڤانییا[١]

هێڤیا من ژ باژێرڤانییا
دا مە ب پارێزن ژ نەخۆشییا
زێدە ل ناڤ گوندییا
هەرۆ زبلێ ل بەر پییا

گوندی خودان پەز و چێلن
چو پاقژیێ ناهێلن
ناڤ باژێری دگەرن و د فێلن
دڤێت ئەم هەرۆ دەینین دەرزییا

عالەم فەقیر و هەژارە
وان گەلەک نینن پارە
زۆر زەحمەتە ئیدارە
ئەز ژ وە دکەم هێڤییا

گاڤا سحاریا خلاسبووین ژ نانی
دێ دەرکەڤین دەرێ خانی
خۆشی ناهێت گینیانی
ژبەر ڕیخا جیرانی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٢/٤/١٤)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەک ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

تو بێژیی ئەڤە نەشولە
دێ ڕابیت کەت بولبولە
وەکی دارا خولولە
دێ بێژی تۆپ تەقییا

چێل و کەرێت وان فێلن
چو دەرۆکا ناهێلن
دیارە خودان ب فێلن
نەخوشییا دبەن هەمییا

بەرێ خۆ بدە هەمی دەرۆکا
وێ ئاڤا ڕەشا جۆکا
نەساخی دێ گەهێت چۆکا
ڤێت وی ببەین ئیتالییا

ئاڤ ژی نە گەلەك زۆرە
دا بشون ڕیخا چێلێ و کەرێ کۆرە
هێشتا خودانا پۆر پۆرە
هوسایە ل ناڤ گولییا

گولی زێدە موسلمانن
ئوسولا دینی دزانن
بۆ ڤان کارا نە خودانن
بەرێ خوە بدە پاقژییا

گوڤ چێکرن مونەزەما
هەما تو ژی وەکی هەما
بەس ل خەلکی کۆمکەن خەما
ما تو ماستی د دەیە هەمییا

ڤێت گوهـ بدەین ڕەسولی
(علیه الصلاه و السلام)
ئەم هاتینە ژ چۆلی
ئەڤە من گۆت هەمییا

(النظافة من الایمان)[1]
یا گۆتی بۆ هەمی ئینسانی
برا ڤێت تو بزانی
خۆ بشوو وەك ماسییا

ئەڤە عەلی بو وە گۆت
مومكینە دلێ وە سۆت
گۆتنا ڕەسولی بۆ وە گۆت
دەربارەی پاقژ ژییا

ئەز عەلی تەتەرخانم[2]
پێشمەرگەكی كوردانم
گەلەك كارا دزانم
نەشێم بێژم هەمییا

---

[1] پاقژی ژ ئیمانێیە.

[2] تەتەرخان ناڤێ بابێ مەلا عەلی، هەلبەستڤانێ ڤێ دیوانێ.

## بەسە شەڕ[١]

چەكا دەينن بەسە شەر
قوتابخانا دەينن هەر
دا بەس بمينين دل كەسەر
ئيرۆ مەيێ هەی خۆش رێبەر

باش گوهـ بدەن رێبەری
ئەو سەرۆكێ لەشكەری
خۆش سەرۆكە عنفەری
وی نەڤێت بۆ مە زەرە

ناڤێ رێبەری مەسعوودە
بۆ خەباتی مەجوودە
ناكەت كارا بيهوودە
ئييلەه كومبوونێ بكەت سەر

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (٢٠٠٢/٧/١٣)ێ، ل (باتيفا - دەڤەرا گوليان) هاتيە ڤەهاندن.

# ئەی بەحشتا کوردا[1]

کوردستان ئەی حەبیبا دل حەبین
تە نا هێلین هندی هەبین
ئەم ل جانیا تە تیر نەبین
توی بەحشتا کوردا سەر زەمین[2]

کوردستان تو ژجانا جانتری
تو خودان باغ و ڕەز و تری
دوژمن چار تەرەف[3] بۆ تە مری
دێ ریێ ل هەمی دوژمنا گرین

هەمی جهێت تە سەیرانگەهن
بەلێ کورد دڤێت تێبگەهن
دا پڵنگ و شێر لێ ب شەهن
دا خەلک بێژیت ئافەرین

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٢/٧/١٤)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] (زەمین) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (ئەرد) ددەت.

[3] ڕەخ، ئالی.

## جهێ ماست و هنگڤینی[1]

کوردســـــتان تـــــو خـــــەم ڕەڤینـــــی
زیـــــــده خــــــۆش و شــــــرینی
جهـــــێ ماســـــت و هنگڤینـــــــی
گولــــــول خۆشـــــــه ب ڕوینــــــی

خودانــــــا کـــــوور و نهـــــێلا
خــــودان کـــەرا پــــەز و عــــێلا
پـــــارتی دوژمــــــن نــــــه هــــێلا
داتــــــو ســــــەری هــــــەلینــــــی

بـــــەرێ خــــۆ بـــده کوردســـــتانێ
ئــــــەوه بویکـــــــا جیهــــــانێ
دڤێـــــت نـــــەهێتـــــه بـــــەردانـــــێ
ســــــەد گــــــوڕ بــــــابێ دوژمنــــــی

کوردســـــتان تـــه کـــوڕ شـــیره مێـــرن
خـــۆ ل بـــەر دوژمنـــا نـــا ڤـــەشـــێرن
هـــەمـــی تشـــتێت تـــه ب خێـــر و بێـــرن
بــــۆ ســــــەحـــــەتـــــا ئینســـــــانی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٢/٧/١٥)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیه ڤەهاندن.

مافی تە پاڕاستینە
نە تالان و گەڤاستینە
ما سەیارا بێ پستنە
دا بمینت بۆ دوژمن منی

ڤێت ژن و مێر ببن حەرەس
دا نەهێنە سەر چو تەرەس
هلۆن دا ببین مەقەس
دا بۆ کەر کەین ڤستانی

عەلی تە هۆزان ئینا
گەلەك جاران تە ڤەهینا
تە کەیڤا کوردا ئینا
تو شاعرەکی بەهدینی

## کەپەنێ بارزانی بکە بەر خۆ(۱)

کوردستان تو خۆ گرکە
کراسێ سۆر پاڤێ یێ زەر ل بەرکە
بەس تو خۆ ب خوینا شەهیدا تەرکە
مت(۲) ببە کەپەنێ بارزانی ل بەرکە

شەهیدان مافێ تە سەرخۆ ڕاکر
دارا ئازادیێ ژ خوینێ تێرکر
پێشمەرگا خۆ ب ڕێبازا بارزانی فێرکر
ئێدی بەسە بەس نانی دووکەرکە

چو جهێت تە نەمان ژ خوینێ زوها
چی دارا هەی خوین گەهشت ڕها
بلا بەس دەنگێ نالینا بێت گوها
کراسێ خۆ یێ سۆر بێخە ژبەرکە

خۆ بخەملینە ب کراسێ گول گول
بەس کول و کوڤانا بێخە دلی
ئێدی چ بێژیت بۆ تە مەلا عەلی
وێ خام تۆپ و تڤەنگە وێب ڕکە

---

(۱) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (۲۰۰۲/۷/۱۵)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(۲) بێ دەنگ.

# ڕۆژا ل کوردستانێ هەلاتی[1]

ڕۆژا ل کوردستانێ هەلاتی
شەوقێ یا دای وەلاتی
هەربژیت سەرۆکێ پارتی
پارتی دەینا دیموکراتی

دڤێت وێ ئەم بپارێزین
کومەڵگەها ڤەگوهێزین[2]
ئاڤاکەین گوندێت هەڕڤتی

دڤێت خەباتێ بدەین شۆلێ
باش بقوتین داهۆلێ
دا کورد بەس بچن چۆلێ
دا ببن خودانێت وەلاتی

دڤێت ئەم باش ڕێکا ڤەمالین
دا بەس ئەم کورد بنالین
ئەڤە ژ مێژە ئەم حەمالین
چ تاری بوو ب سەر مە هاتی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی(٢٠٠٢/١٢/١٨)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(٢) ئەڤ مالکە د بنیاتدا یا کێمە.

دڤێـــــت تاريـــــاتيێ ب ڕەڤينــــــين

مللـــــەتـــێ كـــورد د ڤـــەژينــــين

دا ب ئـــازادی ل كوردســـتانێ ڕوينـــين

دا بـــەس عنتيكـــە بـــرە ژ وەلاتـــی

عـــەلـــی كـــارێ تـــە هـــە نسـحەتـــن

يـــێ گوهـــ نـــەدەتـــێ د خوســـارەتـــن

خـــــۆرت خــــودان دەولــــەتــــن

بـــەس دەركـــەڤـــن ژ ڤـــی وەلاتـــی

# بارزانی کورد ئازاد کرن[1]

بارزانی کورد ئازاد کرن
شەڤ و ڕۆژا خۆڕاگرن
ڤێت ڕێبازێ باش بگرن
باش خەباتێ بکەن هەمی

بارزانی خەباتکر و مە خار
زۆر تێکڤەدا چۆل و بەیار
وی مەسعوود کر ئیختیار[2]
ببیت سەرۆک ڤی دەمی

هندی کورد بمینیت و هەبیت
ناڤێ وی دێ ل سەر زمانێ مە بیت
وێ نێ وی دێ ل هنداڤ مەبیت
دێ بلندکەین وەك عەلەمێ

بارزانی کورد هشیارکرن
ژ کولەداریێ خلاسکرن
وە باشە کورد خۆڕاگرن
دا ب سەربەستی شینکەن چەمی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی(٢٠٠٢/١٢/٢٠)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] هلبژارت.

زەمـــــانێ چـــــەكـــــى چـــوو
هـــات زەمـــــانێ قـــــەلـــــەمـــى
هـوین شــین بكـەن گـەنـم و جـو
دا پێكڤـــــە بـــــژین هـــــەمـــى

كــوردا ژێ دڤێــت حــەق و حقــوق
دا بــرەڤــن خائینێــت چــاڤ بلــوق
مــافێ كـوردا نـــە میــزان و صــندوق
دا وان ژى هـــەبـــن تـــۆپ و گـــەمـــى

# بلا بەس بیت نەزانین و جەهل[١]

بلا بەس بیت نەزانین و جەهل
هەمی پێگڤە ببن مل بە مل
کارا بکەن پێکڤە ژ دل
بەس شەڕێ ئێک دوو بکەن وەك کەوا

ب ڕێبەریا مستەفا بارزانی
کوردا سیاسەت زانی
سەبەب شۆڕەش بوو زمانزانی
ب ناڤێ بارزانی دەولەتا بەرێ خۆ دا وا

بارزانی بوو کورد بو جنسی
دەولەتا بناڤێ وی کورد نیاسی
پیرۆز بیت بۆ وی ڕەئیسی
هەمی کورد ڕاکرن ژ خەوا

بارزانی بوو موهەندسێ شۆڕەشا
ب ڕاستی سەرۆکاتی ل وی د وەشا
سەرێ وی زۆر کەت قەرقەشا
بوونە ساخیا کوردا بۆ دەوا[٢]

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی(٢٠٠٢/١٢/٢٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] دەرمان.

دنیا یا دچیت بەرەڤ گوهۆڕینا
بلا بچیت زەمانێ قەتل و خوینا
ژ بیرا خۆ ببەن دەرد و برینا
ل خرابا ڕاکەن کا ڕاکە وا

تروریست ڤێت دەرکەڤن
دا ئاڤا کەین کوردستانێ
گەر طەعن دێ ب وان کەڤن
پەشێمانیە بەهرا وا

چ پارتا ببت ئیرهابی
دەروکێ خرابیا لێ ڤەبی
وی کار چو جا چینابی
دێ کەڤیت داڤێت کەوا

ڕوباد[1] خۆش نەسحەت بۆ تە کری
کەسێ گوهـ نەدایێ دێ گری
ئەو چوو ڕێزا کەسێ مری
وی نابن چو دەرمان و دەوا[2]

---

[1] ناسناڤێ مەلا عەلی هەلبەستڤانێ ڤێ دیوانێ.

[2] دەرمان.

## ڕەڤا مریشکێ[١]

دێ هــــەرە ســــەدام ســــەد جــــار وەلــــێ
تــە لــەعنــەتــە لــێ بــن ییێــت شــەهیــدا و چــەنــد گــەلــێ
تــە دوعــا دکــرن ل مزگــەفتــا تــە دگــۆت ئــەزم وەلــێ
دوڕنــدە تــە دوعــا نــابن قــەبــوول دێــل دوزەخــێ کــەلــێ[٢]

تـــو مـــەغـــرور بـــووی دگـــەل هـــەر دوو کـــوڕا
تـــو زومـــرا[٣] خـــۆ کـــەفـــتن ســـەد کـــۆر و کـــۆرا
وەکـــی جـــوردی کـــەفتـــی کـــونێ بـــێ ڕۆنـــاهی و چـــرا
ئیــرۆ وە[٤] مــەفــەر نــەمــا هــەی دوژمنێــت ئیمــام عــەلــێ[٥]

ئـــەرێ مـــا خـــودێ نـــە دهـــات بیـــرا تـــە
تـــە ب ســـەدا گونـــدێت کـــوردا کـــرن میراتـــە
کـــورد و عـــەرەب ئـــازاد بـــوون[٦] ژ قیراتـــە
تــە د گــۆت میشــێل ئــەفلــەق نــەبوونــا دوزەخــا وە خۆمــالــێ[٧]

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/١/١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: هەڕە دوڕندە دوعاییێت قەبوول نابن دێل دوزەخێ کەلی.

[٣] دەستە.

[٤] ل جهەکێ دیتر: تە.

[٥] ل جهەکێ دیتر: دوشمنێ گەلی.

[٦] ل جهەکێ دیتر: ڕزگار بوون.

[٧] ل جهەکێ دیتر: تە د گۆت ئەفلەقی نەبوونا دوزەخ بۆ وە خۆمالی.

سەدام تو چت بێژی بۆ وان قەبرێت کومکۆمە
تە نەدزانی کورد قەومەك خۆڕاگر و ب دۆمە
مە دزانی ڕێبازا تە پیە و مەشئۆمە[١]
تیرۆر و ئیرهابێ تو کری ڕەزیل و دەلی[٢]

تە د مالا خۆ ڤە خۆ کر ڕەب و مەلك و ئیمبراتۆر[٣]
تە دەولەتێت جیرانی ستاندن ب زۆر[٤]
تە کر کارێ خۆ خرابی و ئیرهاب و تیرۆر
هەتا تو هاتی گرتن وەك وەحشیا و ب زەلیلی

سیه و پێنج سالا تە خۆ کر سەرۆك جمهۆری
بێ هەلبژارتن و ب تەعدا و ب زۆری
تە ڕۆتبە دان خۆ تە خۆ بلندکر بر ژۆری
پاشی تو نزم بووی و کەفتی تو چووی تالی

تە ب سەدا یێت هەرفاندین دێر و مزگەفت
تە و هەڤالا گۆت باش بۆ مە هەلکەفت
سیاسەتا تە ما ل پاش[٥] یا بارزانی ب سەرکەفت
تە سەر بۆ وەك تەڤنپیرکێ مەژی خالی[٦]

سەد و بیتس ملیار دولار تە دەین کرن

---

(١) ل جهەکێ دیتر: مەشکوکە.

(٢) ل جهەکێ دیتر: مەزنیا تە تو ڕەزیل کری و کریە دەلی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: تە ل عیراقێ خۆ کربوو مەلك و ئیمبراتۆر.

(٤) ل جهەکێ دیتر: تە د گۆت دێ دەولەتێت جیران ستینم ب زۆر.

(٥) ل جهەکێ دیتر: سیاسەتا یا فاشل بوو.

(٦) ل جهەکێ دیتر: هەتا سەرێ تە بوو وەك تەڤنپیرکێ مەژی خالی.

تە و کوڕا قەسر و قوسیریێ ئاڤاکرن
ما وە نە دزانی دێ ڕۆژەکێ هەر مرن
هەتا هوین هاتن کوشتن و گرتن بوون مارێ حولی

پاکا قەسر و قوسیرێت گارەی و ئێنیشکێ[١]
ئیرۆ ل تە بوون[٢] خەون تو ڕەڤی وەکی مریشکێ
مە تو دیتی وەکی تو ئینای دەر ژ کونیشکێ
تە جاب چییە ل بەر دادگەهێ چاڤ حولی

جاب بدە هەی قائیدێ کیمیا و ئەنفالا
نێ تو بووی تە تازی ئێخستی هەمی مالا
هەی قەسابێ مەزن و بچیک و تەفالا
هەتا ئەڤرۆ حەلەبچا شەهید دنالی

تە ل بەربوو[٣] گارەی و مەتینی بگەهینی ئێک
چیایێت کوردستانێ تە برنێ ڕێک
پێشمەرگە هات مەیدانێ کارێ تە نەهات بەرێک
دیرۆکا تە ڕەش هات نڤێسین ل دەستپێکا ئەولی

نییەتا تە چ بۆ وان دیوارێت تە ڕاچاندین
تایبەت وان داروبارێت تە ل ئێنیشکێ چاندین
تە نەزانی زانا داڤ پێل بەر تە دەیناندین[٤]
تو کەفتیێ و هەتا هەتا نامینی والی

---

[١] گارە و ئێنیشکێ، سەر ب قەزا (ئامێدیێ ـ پارێزگەها دهۆکێ) ڤەیە.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئیرۆ ل وە بوو.

[٣] ل جهەکێ دیتر: تەت ڤیا.

[٤] ل جهەکێ دیتر: تە نە دزانی موخلسا داڤ پێل بەر تە چاندین.

کورد و عەرەب و کێماتی بوونە برا
دێ عێراقێ ئاڤا کەن دێ چێکەن ڕێك و پرا
دێل هەمی گوند و باژێرا نەورۆزێ هلکن ئاگرا[1]
دا تو ببینی کوردا و تەحالفا[2] زوڵماتە ڕامالی[3]

ئەرێ تە شەرم ژخۆ نەکر وەکی هاتین دەرێ کونێ
تە خیرەت ژێ چوو تو نەمای وەك یەك ژنێ
بلا تە خۆ کوشتبا ب تەلقەك تنێ
تە خۆ متکر و ڕەزیلکر تە لوتلەك ل خۆ نەدا وەك کولی

پا کا مێرانیا تە هەی سەر مەزنێ گژاڤژ
هەی خوینمێژێ عێراقێ و هەمی مرۆڤ کوژ
تە چەك ڤێ هەبوو تە بوو نەکر قژ
خودانێ تانك و تۆپا و دوشکێت چار لویلی

تە خود دەینا (المؤمن المجاهد)[4] سەدام
هەمی دیعایەت[5] بوون ئەو گۆتن و کەلام
کارێ تە بوو کوشتن و سۆتن و بووی هەدام[6]
دێ پالڤەدە ل گرتیخانێ پفکە یا لێلی

---

(1) ل جهەکێ دیتر: دێ ل هەمی گوند و باژێڕا نەوروزێ.

(2) وەلاتێن هەڤپەیمان.

(3) ل جهەکێ دیتر: هەلکەین ئاگر داتو ببینی کورد و تەحلفا زوڵما تە ڕامالی.

(4) وێرانکەر.

(5) ل جهەکێ دیتر: هەمی درەو.

(6) باوەردارێ شێرکێش.

هندی ئەز درێژ کەم و ڤەهینم هۆزانێ

ڤێت تو نەمینی یان هەتا هەتا ل گرتیخان

ژ تە ناهێت وەرگرتن مافێ گوندەك كوردستانێ

ئەڤە سیهـ و پێنج سالە یێل بەر سینگێ تە عەلی

## زەرقاوی[1]

باش گوهبدە من گونەهکار زەرقاوی
هەی درەوکەرێ حیلە بازنێ وەك واوی[2]

کوشتنا مسلمانا کەنگی جیهادە
ئەوا تە گۆتی نە ئیسلامیە ئیلحادە

تەیا گۆتی کورد نە مسلمانن
ئەوێت ڤان گۆتنا دبێژن بێ ئیمانن

کورد مسلمانن ب حەقیقی
تو تەلمیزێ[3] بن لادنی بۆ سەدامی ڕەفیقی

تو مرۆڤەك جاهێلی و بێ دینی
قودس ئازاد کر کوردێ مێرخاس سەلاحەدینی[4]

هوین زارۆکا د سەردا دبەن
کارێ تیرۆرێ ب وان دکەن

دبێژنە وان هوین بەحەشتینە
ئەگەر ڕاستە تو هەرە خۆب پەقینە

تو ددینێ ئیسلامێ نا گەهی
تو ژ ڕاستی دویری گوهـ تاژی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/١/٢)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ئەحمەد زەرقاوی (١٩٦٦-٢٠٠٦).

[2] وەك ڕویڤیان.

[3] قوتابی.

[4] سەلاحەدین ئەیوبی.

تـــو ئاياتـــا شـــلوڤه دكـــەی زەرقـــاوی
تـــو ژێ دويـــری تـــو كـــويڤی نـــەگـــەهـــی

تـــوی كـــادرێ تيـــرۆر و تيرۆرســـــتانێ
تـه يـا حـەلالكـری كوشـتنا كـوردێ كوردسـتانێ

گوهـ بده ڤێ ئايەتێ (من قتل نفسا بغير نفس)[١]
دژی ڤـــێ ئايـــەتـــێ تـــە بـــەلاڤوكێـــت نڤێســـين

ئـــەرێ مـــا تـــو ژ خـــودێ نـــا ترســـی
تـــو ل ڕێكـــا ڕاســـت نـــا پرســـی

خـــۆ هشـــياركه هـــەڤـــالێ شـــەيتـــانی
ئـــەز دزانـــم تـــو چ ژ دينـــی نزانـــی

بـــلا بـــەس بيـــت ئـــەز درێـــژ ناكـــەم
گـــەر هـــەتكـــا تـــە پتـــر دا بـــەريـــا كـــەم

بـــەرێ خـــۆ د دەم تـــە تـــو زالـــی
كـــەنگـــی بـــۆ كـــوردا مـــەرامـــە فيـــدرالی

وەيـــــلا درەوكـــــــەرێ درەوكـــــــەر
دێ تـــە ل حـــەشـــرێ چ بيـــت مـــەفـــەر[٢]

---

[١] چيێ ئێكی بكوژيت نه هەژی كوشتنێ بيت.

[٢] دەرگەهـ.

## بۆ ڕەڤەندی[1]

مــــن هـــەوارە گـــەلـــی کـــوردا
ئـــەزێ کـــەفتـــیم کـــول و دەردا
کـــورە و شـــتێ خـــۆ مـــە بـــەردا
مـــە هـــاڤێتن جلێـــت کـــوردی

مـــە خـــۆ دا لایـــی مـــودێلا
مـــە تـــورێ کـــوردی تێـــك شـــێلا
بـــەهـــرا پتـــر مـــە ئـــەو هـــێلا
مـــە هـــێلا عـــادەتـــێ گونـــدی

ئـــەڤـــان جلکێـــت حـــەرام و تـــەنـــگ
دکـــەن بـــەر خـــۆ مێـــر و ژنـــك
دا بـــەیـــانبن ڕتـــل و مـــەمـــك
هـــەتـــا هـــەمـــی بـــوون ئـــەفـــەنـــدی

جلکێـــت کـــوردا شـــەرعینـــە
چـــو حـــەرامـــی تێـــدا نینـــە
جلکێـــت نوکـــە حـــەرامینـــە
پـــیس و کـــرێتن و نـــە جنـــدی[2]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٢/٤)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] نە جوان.

ژن شـــەڕیـــت كـــەن بـــێ ســـلاح
یێـل بـەر وان لباســی نــە موبــاح[1]
ل ســـوكا دگـــەڕن وەك فـــەلاح
ڕێڤــە دخــۆن توفكیــت كولنــدی

هــــــۆ نینـــــە كــــــوردەواری
گـــەلـــەك یـــا بـــێ عـــاری
هـەچكـو نـە خـەلكـی ڤـی واری
هــــێلا ڕەوشــــــتێ كـــــوردی

چێكـــەت ڕوبـــادی خۆلیبســـەر
وی نـــە پشـــتە و نـــە بـــەر
زۆری ســـلە بـــێ مـــەفـــەر
ئـــەو ژی چـــوو بـــۆ ڕەڤـــەنـدی

(1) نە دروست.

## کوردستان من حەش[١] تەکر[٢]

کوردســـتان مـــن حـــەشـــتە کــر
مـــن ژیـــێ خـــۆ گـــوری تـــە کــر
شــــەڤ و ڕۆژا مــــــن هزرکـــــر
ڤییانــــا تــــە مـــن پتـــر کـــر

کەس نەدشیا من و تە ژێکڤە کەت
دا ئـــەم ژێـــك دویرکـــەڤـــین
مـن خـەبـات کـر کـەسپ و کـەت
ڕۆژ ب ڕۆژ ڤیـــــان پتــــر کـــــر

ڤینــــا تــــە چـــەنـــد زۆرە
زۆر زۆرە بــــــــــێ ســــــــنۆرە
کـــا چـــەوا ڕۆناهییـــت ڤێـت کـۆرە
حوببـا تـە جهـێ خـۆ ل دەڤ مـن کـر

شـــەڤ و ڕۆژا ئـــەوا ل بیـــرا مـــن
چوجـــارا ناچیـــت ژ هـــزرا مـــن
چنکو جهێ خۆ یێ کری ل دەڤ من
حـەژێکرنـا وێ یـا ل مـن بـی ئـاگر

---

(١) حەز ژ.

(٢) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٢/٩)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

ئــەڤــە ئــەز پیــر بــووم بــەلــێ
دلـــێ مـــن هـــەر جـــەحێلـــە
دلــێ مــن هــەر گــەشــە وەك پــەلــێ
ڤیانــا وێ یــا ل دەڤ مــن بــی شــەکــر

ئـــەز کـــوردەکـــی بـــێ ئـــاخم
دا دارەکـــــێ لێـــــب چیـــــنم
ژ خـــەمێـــت تـــە دا نـــەســاخم
ئـــەزم بـــۆ تـــە بـــەرخـــێ کێـــر

نـەشـێم مـافێ تـە سـەرخـۆ ڕاکـەم
یـــــا وان ئـــــاڤ و دەراڤـــــا
یـا بـاش ئـەوە خـۆ گـوری تـە کـەم
خۆشــییا تــە ل دەڤ مــن زێــدەکــر

مـــن تامـــا تـــە یـــا زانـــی
لـــەوا بـــۆم پێشـــمەرگـــێ بـارزانی
تـــــە زۆرن مێـــــرگ و کـــــانی
لــــەوا مـــن خـــۆ فیـــداکر

# سوپاس بۆ خودی[١]

سوپاس بۆ خودی مەزن
هەر دوو پارتی کرنە تفاق
ل ئێك دوو ناکەن گازی
بلا بەس بیت کوردا نفاق
پێکڤە مەلا بدەنە ئێك
قەلەما بگرن ڕێك و پێك
کارا باش بینن بەرێك
دا خرابا نەبیت ڕێك
ئەڤە هەشتێ و چار سالە
عیراقا بوویە دەولەت
کورد ژی ل گەل وان هەڤالە
نەدایە کوردا چو قیمەت
ژ ملکا بگرە تا سەدامی
یا ل کوردا کری نەمامی
کورد مەجبوور بوون هەمی
بخازن مافی قەومی
دەولەت سەری خودی بۆشی
زوڵما بەعسی ڕامالی
ل عیراقێ کر خۆشی
کورد ئازاد بوون ب دەلالی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٧/٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

بەرێ خۆ بدەن كورد و عەرەبا
یا بێ چویڤ ڤەكێشكانێ
ب دەڤێ دبێژن مەرحەبا
ب دلی نابێژن هانێ
ئەڤە چەند حیوار[1] هاتن كرن
ل سەر بەندا پێنچی و هەشت
عەرەب چو عبرەتا ناگرن
چو باوەری وان نە هشت
گۆتن و كریارێت وان نە ئێكن
نە جهێ باوەریێ نە
كورد نهۆ ب ڕێكوپێكن
تە و تابعیت ڕاستینە
ڕوباد بەسە درێژیش كرن
فایدە نینە دگەل نەزانی
ما چی مایە نە هاتی كرن
مە یێ هەی خودێ و بارزانی

(1) دانوستاندن.

## خۆ هشیار کەن[1]

خۆ هشیار کەن گەلی کوردا
نهۆ یا هاتی فرسەت
ئاڤاکەن بازێر و گوندا
هوین خۆ بکەن دەولەت

مەزنا یا بۆ مە گۆتی
هیڤیا دەرا خۆلیا سەرا
مە کوردا یا خۆ سۆتی
ئالا بلندە ئاشکەرا

جابێ بدەن دەولەتا
بلا بێن ناڤ خلمەتا
بلا بدەن مە ئالەتا
دا خۆ ڕاگرین هەتا هەتا

کوردا ب هزارا شەهید
ل سەر ئاخا کەرکۆکێ
هەمی فێرس و عەگید
ل سەر ڤێ ناڤەرۆکێ

بەرێ خۆ بدەن خەریتا
کا چەوا هاتیە کێشان
قەت گوهـ نەدەن فەلیتا
کو ئەو خۆ لێبکەن خودان

کەرکۆك سەد کیلومەترا
ژ تکریتێ یا دویرە
دوژمن یێ چوویە تێکڕا
حسابا وان یا هویرە

ژ چیایێ شنگالی حەتا فەتحە
سنۆرە بۆ کوردستانێ
خودێ یێ دانای بۆ مەتحە
مافێ عەرەبا کانێ

عەلی تە ڕاستی گۆت
دلێ دوژمنا تە سۆت
وان حەرام بیت بەلۆت
وان مرۆڤانی فرۆت

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٧/١٤)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

# تو ب خێرهاتی پیری[1]

تو ب خێر هاتی سەر چاڤا پیری
تە د گەل خۆ ئینان سەد بەلا و ژیری

گەر مرۆڤ هزرا خۆ بکەت ب هیری
کا چەوا ژبۆ چو بکاتی هەتا پیری

کەس پێ نەحەسیا مە هندیت سەر بۆ هری
چاڤ تاریبوون ددان کەفتن ناخزن تری

گوهـ کەر بوون ناڤ مل خار بوون
کەفتن پور پورێ بۆ مالێ خۆ ژ بێ ماتی

چوونا دەست ئاڤێ بۆ وان زەحمەت بوون
کەس پویتە پێ ناکەت ژ بێ عاری و غەفلەتی

چو ب دەستێ مە پیرانە ما
ژ غەیری کوڤان و دەرد و غەما

چو ژ دەستێ وان رۆژا کەیف و سەما
برینێت وان ناهێ دەرمانکرن ب ملحەما

چنکو چو فایدێ کەسێ ل دەڤ وان نەما
بوون قورمك ل قورنەتێ هشك ئاڤ تێ نەما

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٥/٩/١٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

دێ گازندا کەن خوزی سەد خۆزی
من ددان هەبان دا من خاریا ترۆزی

من هەبان هێز و پێ چوو بام ل ئەڤرازی
وەك جارێ جارا من کربان مازی

دێ هێت بیرێ چوونا ناڤ ڕەزی
وەکی د چو نێچیری ل چیا سەر ئاڤا تەزی

هەمی کار دێ مینین بۆ وێ خیال
ژ هەمیا دەست ما خالی و بەتال

پویتە پێ ناکەن نە کور و نە مام و خال
سەراوینا دەن چو دوست و هەڤال

چنکو ژ خۆدێ ناترسن بێ کەمال
نابێژن ئەڤە ژی جەحێل بۆ دەلال

## قوتابخانا ئیلونێ[1]

شورەشا ئیلونێ قوتابخانا كوردا بـوو
مـام هوسـتایێ وێ مـەلا مسـتەفا بـوو
خانـــدنا وێ زور یـــا ب بهـــا بـــوو
هـــەمـــی جورێـــت زانینـــێ تێـــدا بـــوو

ســـەران ســـەرێ هـــەمـــی كوردســـتانا
پێـــت بـــووین سیاســـی و زانـــا
چێتـــر بـــوو ژ ڤـــان قوتابخانـــا
خانـــدەڤانێـــت نـــە وەك وابـــوو

ژ خانـــەقـــین هـــەتـــا زاخـــۆ
خانـــدنا وێ دەینـــا بـــەرخـــۆ
هـــەمیـــا پێـگڤـــە كـــر هـــزرا خـــۆ
بـــوون شـــورەشـــگێر جـــوداهی نـــەبـــوو

پێـگڤـــە هـــەمـــی بوونـــە بـــرا
بـــۆ خزمـــەتـــێ بوونـــە چـــرا
وان نـــاڤ گـــەریـــا ل هـــەمـــی درا
هـــەردەم ئـــازادی ل بیـــرا وابـــوو

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٥/٩/١٤)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

دەر و جیران هاتن ڤێ مەدرەسێ
هەمیا گوهێ خودا دەرسێ
هەتا پێ گۆت عەلی بەسێ
چونکی ئەو ژی وەکی وابوو

ب چەکێت زەعیف دچوون دەبابا
ئەگەر چەکێ نوکە وان هەبا
دا بێژن مووسل و بەغدا مەرحەبا
وان باوەری ب بارزانی هەبوو

وان دنیا ل بەعسیا کر تاری
جەیشێ سووریێ هات هاری
پێشمەرگا ئەو ڕەڤاندن کەتن ڕووباری
ڕۆژ ب ڕۆژ مێرانی لێ زێدەبوو

مە حوکمەتا عیراقێ نەچارکر
بەیانا یازدەی ئاداری دیارکر
مە کر دیرۆك و ئیعلان کر
بەرهەمێ وێ قوتابخانێ بوو

## نەڤی[1]

من سەر ڕەش بوو یێ بووی کەڤی
ددان کێم بوون ل ناڤ دەڤی
من کچ دان شوی زۆر بوون نەڤی
خارنا منە زادێ شەڤە

ئەز مام تنێ بووم پیرە مێر
مام بێ خودان نینن چو نێر
من کەس نەمامە بێ خێر
فایدە نادەن زاڤا و نەڤی

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٩/١٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## ئوسامە[1] و زەرقاوی[2]

ئوسامە بن لادن و زەرقاوی
بۆ مسلمانێت بووین ژەهراوی
دل ڕەقن حیلەکەرن وەك واوی[3]
ژ ئیسلامێ دویرن وان خە هاوی

ژ قەومێ لوتی پیسترن گەلەك
دێ ل دوزەخێ سۆژن بن خەلەك
وان نابن چو ڕەڤ ل وان نەیارەفەك
بریارا پێدای عالمێ مسری تەنتاوی

وان جاب چیە ڕۆژا قیامەتێ
وان بەلاڤکرن ئەڤ تیرۆرە ل ناڤ ئوممەتێ
کەسەکێ ل دویڤ وان بچیت ل سەر ڤێ خەتێ
دێ خوسارەت بیت چو نابیت فایدێ وی

وا ژ کویڤە ئینا ئەڤ ڕێبازا شەیتانی
هو بووینە نەیارێت ئەڤی دینی
ژ ئیسلامێ دویرن ژ ئەردی تا ئەسمانی
ل ڕۆژا حەشرێ گرانە حسابا وی

---

(١) ئوسامە کوڕێ لادنی (١٩٥٧-٢٠١١).

(٢) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٩/١٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٣) وەك ڕویڤی.

چنکـــو ئـــەو دێ چـــن (درك الاســـفل)[1]
نـــاڤ ئـــاگرێ دوزەخـــێ یـــێ هـــەلهـــەلـــی
ئـــەڤـــە بریـــار پێـــدا مـــەلا عـــەلـــی
گـەر تـەوبـە نـەكـەن دێ نـەخۆشـێ بـرن قـەوی

وان دنیـــا یـــا ل مســـلمانان تـــەنگـــاڤكری
ب هـــزارا بچویـــك و مـــەزن شـــەهیـــد كـــری
دەیبابێـــت وان هـــەر بـــۆ دكـــەن گـــری
چـــو فایـــدێ بـــن لادنـــی نـــادەت مـــالێ وی

---

[1] داویا دوزەخێ.

# شۆڕەش ڕابوو پیا[1]

یـــــازدەی ئـــاداریَ هاتــــەڤــــە
بیرهـــــاتن دگــــەل خـــۆ ئیناڤـــــە

بیرهاتنــــــا ســــــالا حــــــەفتــــێ
مــــافێ کـــوردا قـــەرار کـــەفتـــێ

ل حــــەفتـــێ و پێنجـــێ ئـــەیلـــۆلێ
جارەك دی پیشمەرگە بەر بۆ چۆلێ

حوکمــەتــا عێراقــێ خــۆ پێـك ئینــا
قــــرارا جــــــەزائیــــــر[2] دەرئینــــــا

قیـــــادا کــــوردا چـــــوو ئیرانــــێ
پێکئینـــــا شـــــۆڕەشـــــا گــــولانێ[3]

پشـــتی مـــودەهـــەکـــێ[4] کـــورت
شـــــۆڕەشـــــا مــــــە بووڤـــــە خــــورت

پێشــمەرگــە کــەتــە دەشــت و چیــا
شـــــــۆڕەش ڕابــــــوو ســـــــەر پیــــــا

ژیــێ شــۆڕەشــێ بــۆ چــل و چــار ســالی
بــــدەســــت خۆڤــــە ئینــــا فیــــدرالی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٣/٢/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] ڕێککەڤتنامەیا ئەلجەزایر (١٩٧٥).

[3] شۆڕەشا گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨).

[4] ماوەکی.

سەخمەراتی خوینا شەهیدا
فیدرالی وەرگرت عەگیدا

مخابن بۆ شەهیدێت سوباتێ[1]
بچاڤ نە دیت فیدرالی ل قاتێ

دا وان کربا مزگینی
وەکی د چوونە نك بارزانی

زەرقاوێ ئوردونی
نەهێلا بچیت ئەو مزگینی

[1] شەهیدێت شوباتێ، ل سالا (٢٠٠٤) هژمارەکا زێدە ژ سەرکردێن کورد شەهید بوون.

## پێشمەرگە[1]

پیشمەرگێت گولی و سندییا
بەعسی ئێخستن بن پییا
وەك شیرا ڕابوون سەر پییا
سەدامی پشت خەلییا

پیشمەرگێت دۆسکی و سولەیڤانی
عەدما بەعسییا ئانی
دیارە سەدامی نە د زانی
ئەو نەشێت شێرێت چییا

پێشمەرگێت بەرواری ژوری
سەدام ببیت ب گوری
وی عەسکەر ڕەڤی وەك توری
پشتا وان شکەست خەلییا

پێشمەرگیت گوران و زیباری
دنیا ل بەعسیا کر تاری
لەشکەری سۆری هات هاری
ئەو ژی ڕەڤی ب گەمییا

پێشمەرگێت سویرچی و هەرکییا
زوو زوو ڕابوون سەر چییا
پڵنگێت دەشت و چیا
دوژمن ژبەر ڕەڤییا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٢/٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

پێشـــمەرگێـــت ســۆران و بـــارزانی
دوو عـــەشـــیر نێـــروە و ڕێکـــانی
فـــــەرمانـــــا جاشـــــا ئـــــانی
بـــوون گلێشـــی بـــەر پییـــا

خـەلکی کیـك و هـەسـن و میـرا
ئـــەوان دەســـت دا چـــەك و شـــیرا
چـــون مـــەیـــدانا جهـــانگیرا
بـــەعســـێ ئـــاگر ڤـــەمریـــا

ئـــەڤـــە کاکـــەئـــی و فـــەیلـــی
ڕابـــوون ســـەر خـــۆ وەك فیلـــی
ل جـــەنگـــی کـــر تلیلـــی
دوژمـــن ل بـــەر وان چـــەمییـــا

## من نەڤێت کوردستانا بی کەو[1]

مـن نـەڤێـت کوردسـتانا بـێ کـەو
ل سـپێدا وەکـی لێـدخوینن ئـەو
خـەو گرانـا ڕادکـەن ژ خـەو
بنـدەسـتیێ قـەبـوول ناکـەن ئـەو

دەنگـێ کـەوا زۆر خۆشـە
گـاڤ و دەمـا وان خورۆشـە
کوردسـتان ب وان خۆشـە
گاڤـا ڕابـوون دکـەن نـەو

دگـەل بـانگێ سـحارێ
دێ ژ لیسـا هـێن خـارێ
دێ چـن شـەڕا وەك تـەیـارێ
دێ بیـت شـەڕ و لێکـدان و هـەو

دێ گـەرن ل دور مـەسـەبـا
دێ کـەن گـازی و قـەبقـەبـا
نـا ێیـت ئێـك دوو مـەرحـەبـا
وە سـیفەتـێ کوردانـە ئـەو

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٢/٢١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## بهار[1] هات و یا نێزیکه[2]

بهـــار[3] هـــات و یـــا نێزیکـــه
هـــەمـی تـــەیـران[4] زیکـــه زیکـــه
بـــۆ مـــە هـــەمیـــا[5] خۆزیکـــه
بـــلا بهێـــت ســـەرچاڤـــا

بـــلا بهێـــت خـــەم ڕەڤـــین
گـــەلـــەك خۆشـــه تێـــدا ژیـــن
بـــۆ ســـەیرانـــا بـــەرهـــەڤـــین
دا بچـــین ســـەر ســـویلاڤا

ســـــیبەرا دار و بـــــارا
یـــا خۆشـــه بـــۆ دلـــدارا
جهـــێ شـــەهیـــد و هـــەژارا[6]
هـــەڕن لـــێ بکـــەن ســـلاڤا

---

(1) ل جهەکێ دیتر: بوهار.

(2) ئەڤ هەلبەسته ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٢/٢٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیه ڤەهاندن.

(3) ل جهەکێ دیتر: تەیرِ و تەوالا.

(4) ل جهەکێ دیتر: بوهار.

(5) ل جهەکێ دیتر: بۆ هەمیا.

(6) ل جهەکێ دیتر: جهێ فەقیر و ژارا.

بهارا[1] کوردستانێ
خۆش جهە بۆ ژیانێ
وەرن دا بچین سەیرانێ[2]
ژێ تێت بێهنا گولاڤا

تەژییە[3] ژ هاڤینگەها
جهەك خۆشە پڕ بها
هەڕن ڕۆنن ل بەر سها[4]
بلا تو بدی دراڤا

حەوجە نینن بەفر و جەمەد
ئاڤ تەزیە بێ حەد
خیارا دکەت دوو قەد
جهێ نێچیر و راڤا

بهار گەلەك پیرۆزە
یا تێدا چەنا نەورۆزە
بۆ هەمی کوردا دۆزە
کوردستان بویکە شەهید زاڤا

---

(1) ل جهەکێ دیتر: خۆشە بهارا.

(2) ل جهەکێ دیتر: سەرەدانێ.

(3) ل جهەکێ دیتر: یا تەژییە.

(4) سیبەر.

## خودانێ خەنجەرێ[1]

رەحمەتی بیت بارزانیێ پاشا
خودانێ کەڤر و تراشا
خودانێ خەنجەر و شاشا
ناڤێ جاشا دەینا سەر جاشا

هزرا خۆ بکەن ل بارزانی
کا چەوا شۆڕەشکر و زانی
ڕێڤەبر و پێسک ئانی
نوکە ژ دەرڤە تێن تەماشا

ئەڤرۆ مەسعوودێ ل شوینا وی
ئەوی هەلگرت ئەرکێ وی
پێ خۆ دەینا شوین پێ وی
قەلەم دانان جهێ ڕەشاشا

وی دڤێت مافێ هەمی مرۆڤا
هەمی ئوجاخ و هەمی توڤا
ئەوە دژی کەرچوڤا
لەو سەرۆکاتی لێ وەشا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٢/٢٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

وەکی دچیت کومبینا
چی گۆتنا باشە وی ئینا
بیرناکەت چو برینا
وەرگرت مەدالیا باشا

دبێژیت ئەم عێراقینە
نابەینا چو کەسا فرق نینە
ل سەرێکا دیموکراتینە
جوداهی نینە نابەینا عەگال و شاشا

فەیلی کوردن و شیعەنە
بەهرا پتر سوننەنە
کەس نەبێژن کەس نە نە
دا ل بەرخوە ڕاگەین ڕەشا

ڕوباد ئاخفتنێت تە چێکرینە
هەمی ژی ب کوردینە
تە ژ کیرێ کومکرینە
تەیا کری هەڤالینیا دەروێشا

## وەکی مرۆڤ دچیت بارزان[1]

وەکـــی مـــرۆڤ دچیت بـــارزان
دل دکـــــەڤیـــــت لــــــەرزان
ل بـــەر زۆریـــا شـــەهیـــدان
ئـەویّت ڕیّـز بـووین ل قـەبرسـتان

ئـــەو شـــەهیـــدیّت ئـــەنفـــالکری
ل گورســــــتانێ ڕیّزکــــــری
دڤیّـــت مـــرۆڤ بکـــەت گـــری
ژیـــــەر مخابنیــــــا وان

بارزانـــە پایتـــەختـــێ شـــەهیـــدا
جهـــێ فیّـــرس و عـــەگیـــدا
شـــــۆڕەشـــا ل وێ ڕویــــدا
ل ســـەر ئاخـــا کوردســـتان

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕیّککەڤتی (٢٠٠٦/٣/٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپیّکا مالکا ئیّکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## گونەها مەزن[1]

چەند گونەهـ بوو سەد و هەشتێ و دوو هزار ئەنفالکری
خراپتر بوو ژ حەلەبچا شەهید کیمیا کری

یان هشت هزار بارزانی هنداکری
یان بالیسان و بازێ و تویکا[2] وێرانکری

ل حەلەبچێ ب سەدان تەرم و لاشێت رێز کری
بچووکێت ساڤا ل بەرسینگێ دەیکا مری

ئایا ما کورد نزانن کییە ئەڤ گونەهەکری
ئەم هەمی دزانین سەدامێ خوینمێژ نهۆ حوکمکری

من بریاردا سەدام و هەڤالێت خۆ د چن ئاگری
ل سەر ڤێ گونەها هندە مەزن یا وان کری

بەهرا پترا خەلکێ کوردستانێ ئیماندارن پتری
کەسێ ئیماندارا بکوژیت خودێ لەعنەت یا لێکری

کورد مسلمانن ژ ئوممەتا پیخەمبەری
ئەنفالکرن کیمیا کرن سەدامێ سەرسەری

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٨/٣/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) تویکا، گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا (سندیان) ل سالا (١٩٨٨)ێ، هژمارەکا پێشمەرگەیان ب چەکێ کیمیاوی هاتنە شەهید کرن.

هندێ چەك و تەقەمەنیێت دەولەتا حەرام كری
سەدامی یێل مللەتێ كورد وەركری جەربە كری

ب شریعەت درستە سەدامی بكوژن وەك كافری
بێ مەحكەما حاكمی خودێ یێ حوكوم كری

وەزارەتا سەدامی گونەهكارن وەك سەدامێ ژ ناڤبری
هەمی ب دلێ سەدامی بوون بخۆ كومكری

دگەل كوردا و شیعانە نەیارەتی كری
ب سەدا دێر و مزگەڤت كاڤل و ویرانكری

ئەز دشێم بێژم هندی كەسێ بەعسی تەنزیم[1] كری
نە جهێ باوەریی نە ل ناڤ حوكمەتا نوی چێكری

عەلی بەسە تە گەلەك یا بری دەرەدەسەری
دژی حوكمێ سەدامێ خوینرێژ لەشكەریاكری

---

[1] رێكخستن.

## بۆ بێ دینا ئەز بەلامە[١]

ئەز کوردەکم نیف مەلامە
بۆ بێ دینا ئەز بەلامە
من بەلاڤکر ئەڤ کەلامە
بۆ وان کەسا بووین بەلامە

بۆ جیرانا ئەڤە بەیان
ب ئاشکرا من کر ئیعلان
کورتە دەرسێ دێ دەمە وان
فیدرالیە بۆ مە دەرمان

بلا دەستا ژ مە ڤەکێشن
بەس خوینا کوردا هەلکێشن
دا بەس دلێت مە ب ئێشن
کورد ژی خودان کیش و بیشن

دوژمن بلا باش بزانن
کورد چێتر وان مسلمانن
شەعبەک قیمەت گرانن
جیرانیێ باش دزانن

کوردستان ئاخا کوردانە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٦/٤/١٢)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

دوژمن تێدا مێڤانە
سەر بە خوی مافی وانە
کورد بۆ جیرانا خۆش برانە

ترك و فارس و عەرەب
ئەو بخۆ ییێت بووین دەولەت
فیدرالی ل وان بۆ عەجەب
کوردا ژی دڤێت ببن حوکمەت

ئەڤە ڕوبادی گۆتە وە
دەستا ژ کوردا هەلکیشن
ئەگەر دێ بیت بەلا وە
دی سنۆرا کەلێشن

# چ ناڤ لێدانم[1]

ئـــەز نـــزانم بـــۆ ئـــادارێ چ بێـــژم
چ نـــاڤ لێـــدانم بـــۆ گوهـــدارا دارێـــژم

مـــن نـــاڤێ وێ دەینـــا شـــین و شـــادی
ل ناڤـــدا هـــەنـــا نـــەخۆشـــی و شـــادی

حـــەفـــت بیـــرەوەری هـــەنـــە ســـەرەكـــێ
دێ بـــۆ گوهـــدارا بێـــژم ئێـــك ل دیـــڤ ئێكـــێ

ل ئێكـــی ئـــادارێ شـــەهیـــد بـــۆ بـــارزانی
ل واشـــــــنتن ل وەلاتـــــــێ بیـــــــانی

ل چـــاردەی ئـــادارێ بوونـــا بـــارزانی
خـــودێ عـــەفوكـــەت ل بـــەحـــەشـــتا نـــورانی

كیمیـــا بارانـــا حـــەلـــەپچـــە شـــازدەێ
ل بیست و سێ ئاداری شۆڕەشا ئیلولێ چو خارێ

ل یـــازدەی ئـــادارێ بـــەیانـــا پیـــرۆز
ل بیســـت و ئێكـــی ئـــاداری جـــەژنـــا نـــەورۆز

ل دوازدەی ئـــادارێ ســـەرهلـــدانا قامشـــلۆ
كـــورد هـــەتـــا نوكـــە بـــێ ناســـناما نامانـــە وولـــۆ

ســـــلاڤ بـــــۆ خـــــودانێ خـــــەنجـــــەرێ
ل ڤـــێ هـــەیڤـــێ هاتـــە دنـــێ و ژێ چـــو دەرێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٤/١٣)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

# هشیار ببن وەك كەوی[1]

بەرەڤ پێڤەیە كوردستانا مە
بەرێ دوژمنا یێل مە
وان ببەرێ ل نەهێلانا مە
دا داگیركەن ئاخا مە

ڤێجا چیە بۆ مە پێتڤی[2]
دڤێت پێكڤە هەلگرین چویڤی
دوژمنا بكین ڕویڤی
دا كوردستان بمینیت بۆ مە

هندی كورد بمینن بەلاڤ
دەستێ دوژمنا دێ هێت ناڤ
دا كورد نەبن ئێك دەراڤ
نە ئێك بوون دبیت سوجا مە

ڤێت ئەم هشیار بین وەك كەوی
دەر و جیرانن بۆ متتە هەوی
ئەی گەلێ كورد بۆ چیت خەوی
بەرێ هەمیا یێل ئاڤ و نەفتا مە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٤/١٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) پێدڤی.

ڤێجـا خـۆ هشـیارکەن ڕابـن سـەر خـۆ
بکـــەن ناڤیـــك دل و دەســـتێت خـــۆ
دا دوژمنـــا دەریـــێخن ژ ئاخـــا خـــۆ
دا ئاڤـــا ببیـــــت مـــــالا مـــــە

هەتا کەنگی بمینین ژێك بەلاڤ و جودا
هوســا قـــەبـــوول ناکـــەت ژ مـــە خـــۆدا
هوســا بمینـــین مـــە تـــالان ل خـــۆدا
پاشـــی هـــەر دوژمنـــەك دێ شـــێت مـــە

کـەس نـەکـەن مـال بخـۆ کورسـیکا
بیـنن بیـرا خـۆ قنـارا و سـێ پێکـا[1]
خـــۆ هشـــیارکەن ڤـــەشـــینن بـــەرپێکـــا
بپـارێزن کوردسـتانێ خۆشـکەن نـالا مـە

مانـە شـەرمـە بـۆ کـوردێ هنـدە بـۆش
بـەس خـۆ ڤـەهـێلن بمیـنن بـێ هـۆش
ئیـــرۆ پێـــل پشـــتا وە دەبلیـــو بـــۆش
خـــۆدێ ڕازی بیـــت ژ بـــارزانیێ مـــە

ئـەڤـە گـوت بـۆ وە برایـێ وەیـێ بچویـك
نـــەهێلـــین دوژمـــن بکـــەن چویـــك
ســـەیـــا ل ســـەروان هـــەی خۆیـــك
ئـەڤـە مـن بـۆ وەگـوت ئـەز مـەلامـە

---

(١) داری سێدارەدانێ.

## هەر دوو ئیدارە بوونە ئێك[1]

کوردسـتان بـەرەف گـەشبینە
وەرە فرۆکخانـا ببینـە
رۆژ ب رۆژ زێـدەت بیـت ژینـە
بـەرهـەمـێ رشـتنا خوینـە

هـەر دوو ئیـدارە بوونـە ئێـك
کاریت مـە دی باشتر هـێن بـەرێـك
هـەمـی پێکڤـە دی روینن دەڤێـك
هـەمیا پێکڤـە کـەیف کـەنینـە

ب ڤێ ئێکگرتنێ دێ هـەلبن چـرا
هـەمـی پێکڤـە دبـن بـرا
باشـتر دی چێکـەن رێـك و پـرا
کوردسـتان دێ بیـت خزینـە

دی ئاڤـا بـن گونـد و بـاژێر
دی زێـدە بیـت خێـر و بێـر
فـەقیـر و ژار دێ بنـە تێـر
دی باشـتر لێهێـت ژینـە

نوکـە سـەرۆك کومـار کـوردە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٦/٤/١٥)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

سەرۆك هەرێم كوردە
سەرۆك ئەركان كوردە
ئەرێ ما ئەڤە نەگەشبینە

وەزیرێ دەرڤە كوردە
جێگری سەرۆكی وەزیرا كوردە
پەرلەمانێ عیراقێ تەژی كوردە
مە چو جارا هۆ خۆ نە دیتینە

# یا ڕەبی [1]

هەتا ئەم کورد نەبینە ئێك
کارێت مە ناهێنە بەرێك
دڤێت ئەم ببین ئێك دەست و ئێك ڕێك
د هەمی کار و بارا دابێن بەرێك

ژێکڤەبوون و بەر بەلاڤی و بێ تفاقی
نابین خودان فیدرالی و کوردستانی عیراقی

ئەز هیڤیدارم ژ کوردێت هەمی کوردستانا
تایبەت مرۆڤێت خاندەوار و عالم و زانا
بەسە ژێك بەلاڤی و براکوژی و برنا تالانا
ببن برا هەمی دا ئاڤاکەن کوردستانا

کوردا هندی دەولەتەکێ بێت داین شەهید
بۆ ئازادیێ بێت بووین بەرید
هەتا کەنگی بۆ دوژمنا بمینین مرید
ئەو ڕۆژ چو نەما و هات ڕۆژەك جەدید

مللەتێ کورد دێ مینیت نامریت
پێشمەرگە دێ هەمی خائینا گریت
ئالایێ کوردستانێ دێ بلند هەلفریت
ئاگرێ نەورۆزێ دێ مینیت هەل ناتەمریت

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٨/٤/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

دێ سنۆرا ژ دوژمنا پاقژکەن دێ ڤەگریت
دوژمن و نەیار دێ خۆ دەنە پاشی دێ گریت
دێ دەستێ هەمی خائین و چەپەلا دێ بڕیت
عـــەدالـــەت دێ مینیـــت باتـــل دێ مریـــت

ئـــەڤـــە فیـــدرالی هاتـــە شـــەقلـــەکـــرن
پێـــــت نـــــەڕازی بـــــلا بمـــــرن
بـــۆ کـــوردا پێتڤیـــــە هشـــــیارکرن
تێبگـــەهیـــنن جـــەمـــاوەری دا خـــۆ ڕاگـــرن

چـەنـد ئـەم پـێش بکـەڤـین کـار پتـرە
گـەلـێ کـورد هشـیار بـە خـۆ ڕاگـرە
ڕاســـتە بارگرانـــە بـــەلـــێ هـــەلگـــرە
مشـــکا ل بـــن دیوارێـــت مـــە خـــر خـــرە

یـــا ڕەبـــی تـــو زۆر ب قـــوەتـــی و بهێـــزی
مـــەســـعوودی بـــۆ کـــوردا ب پـــارێزی
کـــــوردا ئازادکـــــــە ب شــــــانازی
ڕوبـــاد ئـــەڤـــێ چـــەنـــدێ ژ تـــە دخـــازی

# هەر دوو پارتی بوونە ئێك[1]

حەمد و شوكور بۆ خودێ
هەردوو پارتی كرنە ئێك
دی ئاڤا بن بازێڕ و دێ
هەمی كار دی هێن بەر ئێك
دڤێت ئەڤرۆ ژێ ببیت جەژن
دا پێخۆش بن مێر و ژن
دی هۆسا دوژمنا كوژن
دێ چاڤێت حەسوودا ڕژن
هەر دوو سەرۆك بوونە كورد
عیراق و كوردستان ڤەگرت
ڕێ ل دوژمنا گرت
خیانەت ڕەڤی و مرد
جڤاتا بەغدا یا نیشتیمانی
تژینە ئەندامێت كوردستانی
ئەڤە دیتیە ل كێ زەمانی
ڤێت هشیار بین لێ بكین خودانی
سۆریا و ئیران و ترك

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٤/١٩)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

ئـــــــەوێـــــــت گێـــــــڕن پیلانــــــــا

پشـــــــتا وان یـــــا لێبـــــی فـــــرك

دا كـــــــورد نــــــەچـــــن دیوانــــــا

پێلانێـــــــــــــــــــــــــت وان درەون

كـــورد هشـــیار بـــوون وەك جـــەیشـــی

ل كـــــوردا بـــــو كـــــەیفخۆشـــــی

ئێـــــــدی نابیـــــــت نـــــــەخۆشـــــــی

عـــــەلـــــی تـــــە كـــــەیفـــــا مـــــە

ئینــــــــا قوتـــــــابیێ مـــــــــەتینــــــــا

هـــــەیڤـــــا شـــــەهیـــــد هـــــەلینـــــا

تـــــوی پێشـــــمەرگـــــێ بـــــەهـــــدینا

## خۆشتیڤیا من[1]

خۆشـــــتیڤیا مــــن کوردســـــتانه
تـــــــــەژی دار و دارســـــــــــتانه
ئـــــەو بـــــەحشــــتا مـــــە کوردانـــــە
دەیکــــا هـــــەمـــــی شـــــەهیدانـــــە

ژێ تێـــــــر نــــــابم چـــــو جـــــارا
ژبــــــەر کــــــانی و ڕووبــــــارا
خۆشــــــــە بـــــــەر کـــــــارا
وەکــــی دگـــــــەهـــــن دەیکانـــــە

کوردســــــتانه بـــــەرکــــــەتــــی
دەیکــــــا هـــــــەمـــــی ملـــــلـــــەتـــــی
نوکـــــــە باشـــــا پیشـــــــکـــەتـــــی
ئاخــــــا وی پـــــــڕ ژییانـــــــــــە

کوردســـــتانه بـــــەحشـــــتا ســـــەر زەمـــــین
مـــــافی کوردانـــــــە ســــــەر بــــــژین
ئێـــــدی ڤێـــــت ئـــــەم نـــــە ڕەڤـــــین
ڤێـــــت ئـــــەم لێببـــــین خودانـــــــە

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٤/٢١)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

كوردا كچەكا هەى وەكى بووكە
ناڤى وێ ژى كەركووكە
ها نێزيكە نووكە
بگەهێت دەستى كوردانە

كومر تەژييە ل بانكێ[1]
حازرە پانزينا تاوكێ[2]
لازم ئەز بێژم دايكێ
فايدێ هەمى كوردانە

ئەڤە پانزينخانا عنزالا
دێ گەهيتە هەمى مالا
دێ دەينين بەر حەرەس و پالا
بۆ كوردا مەعاش و نانە

---

(١) بانكێ، گوندەكە سەر ب هۆزا سنديانڤەيە.

(٢) تەوكێ، گوندەكە سەر ب هۆزا سنديانڤەيە.

# نەژی بۆ بندەستی[١]

نەژی بۆ بندەستی
بمرە بۆ سەربەستی
ژینە وەلات پەرستی
من گۆت بۆ هەوە ڕاستی

کەسێ بندەست هەژارە
گەر وی هەبن ملیارە
ژین نە دینار و دولارە
گەر تو کورد پەرستی

ئازادی خۆشترە ژ هەیینێ
بلا تو بخوی دەوینێ
هوسا دێ گەهی ژینێ
ئەڤە بۆ هەوە ڕاستی

ژینا بندەست ئێشە
وەك شاخ ڕەنا گامێشە
هەڕە چویڤی ڤەکێشە
کێریا گەهشتی هەستی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٤/٢٤)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

هـــــەڕە ببـــــە پێشـــــمەرگـــــە
خـــاكێ ناموســـێ ل بـــەركـــە
دوژمنـــێن خـــۆ كـــەركـــەركـــە
تـــــوییێ ژ دەســـــتا ڤـــــەرســـــتی

## هۆزان خۆش کەلامە[1]

هـــۆزان خـــۆش کـــەلامـــە
بـــۆ گوهـــدارا یـــا پتامـــە
لـــەوا گۆتنـــا مـــن یـــا تـــەمامـــە
بـــەلـــێ ئیقبـــال نـــەمامـــە

چنکـــو نـــاهێن چـــاپکرن
هـــا نێزیکـــە دێ مـــرن
ڤێـــت هـــەبیـــت خـــودانکرن
دا ئـــەو ڕەوشـــی بـــدەن مـــە

هـــۆزان ڕوحـــە بـــۆ مرۆڤـــا
وەکـــی تـــو ڤـــی بـــۆ شـــۆڤا
ئازادییـــــــە ژ هۆڤـــــــا
ئـــەو چـــەکـــە بـــۆ گـــەلـــێ مـــە

هـــۆزان خۆشـــە ل ســـەر زراڤـــا
مللـــــەتـــــا دکـــــەت ئاڤـــــا
پیـــــرە مێـــــرا دکـــــەت زاڤـــــا
د پارێزیـــــــت زمـــــانی مـــــە

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٤/٢٤)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

هۆزانا کلاسیکی
یا خۆشە وەکی تیسکی
بەلێ باش تو خۆ هیکی
وەکی هێژانا ل بەندی مە

هۆزان ئەوە یا ب قافی
دی بیت هۆزانەك سافی
وەك بزمارێت ئیسکافی[1]
دی هێت بەرێك هۆزانا مە

---

(١) پێنەدۆز.

# خوینا شەهیدا نە ئەرزانە[1]

خوینا شەهیدا نە ئەرزانە
ل نك من زۆر گرانە
وان ئاڤدا کوردستانە
دا دەرکەڤن ژ بندەستان

زۆر نەخۆشە بندەستی
وەکی گینی شکەستی
نا ڕاکەت ئەردێ خۆرستی
چێ نابن باغ و بستان

شەهیدی خوینا خۆ ڕشت
وان دوژمنێ خۆ کوشت
دڤێت وان هەبیت پشت
دا خودانکەن عەیالێ وان

دارا ئازادیێ ئاڤدا ب خوینێ
کوڕێ شەهیدی چوو شوینێ
لاوشین کردارا[2] ژینێ
دا ئاڤا بیت کوردستان

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٥/٤/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] (کردار) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (کریار).

وان یــــا ڕشـــتی خوینـــا گـــەش
دا کوردســـــتانێ بکـــەن خـــوەش
ژ بـــــــــە دوژمنـــــــــێ دل ڕەش
بـــــاش گوهـــــ بـــــدەن ئیتیمـــــان

# ببه دیکلێ ڕۆژەکێ[1]

ببه دیکلێ ئێک ڕۆژێ
نه مریشکا سەد سالی
دا تو دوژمنا بکوژی
دا ب ڕەزیلی نه نالی

ما ئەو چ ژییه مرۆڤی هەی
ل بندەستێ دوژمنی
نێ هەچك و قروق نەهەی
وەلەو تو ببی والی

هندی هندا نەخۆشه
مرۆڤ ل بندەستا
شەڤ و ڕۆژ مەندەهۆشه
ڤێت نەکەت پێ خۆ شەلی

ژ دوژمنا باوەر نەکەن
ئەگەر بۆ ته خۆش گۆت
وان دڤێت ته سەردا ببەن
ئەون ژ ڕاستیا خالی

---

(١) ئەڤ هەلبەسته ل ڕێککەڤتی (٢٥/٤/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیه ڤەهاندن.

گـــەر دوژمنـــێن مـــە مســـلمان بـــن
دا مـــــــافێ كـــــــوردا دەنـــــێ
وەك تـــرك و فـــارس و عـــەرەبـــان
دوژمنـــــــێن ئیمـــــام عـــــەلـــــی

# ڕزگاری ب زەحمەتە[1]

چی مرۆڤێ نە موخلس بیت
ل بندەستا خلاس نابیت
دائیم دێ تەپەسەر بیت
ئەو نا بینیت ڕزگاری

ڕزگاری ب زەحمەتە پێزانین
چو زەڤی شین نابن بێ ئاڤ و کولین
ڤێت جەماوەری تێبگەهینین
دا ئەو باش بکەن کادری

باشترین چەك زانینە
دا بزانن دێ چکەن
خۆ بدوژمنا بحەسینە
هێشتا نەبووی نەیاری

بخازە مافێ خۆیێ شەرعی
ل دەستپێکا ئەوەلی
دا تو بەس بمینی ڕاعی[2]
ل بەرپەرێ نەیاری

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٦/٤/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) شڤان.

بـــەری نوكـــە ئـــەم كـــوره بـــووین
نوكـــە ئـــەمـــپ چاڤكـــەتـــین
بـــێ پـــێلاڤ و كـــوره بـــووین
نوكـــە دووشـــەك یـــا بـــی هـــری

ڤێـــت چاڤـــا باشـــتر ڤـــەكـــەیـــن
بـــەلا دوژمنـــی ژ خـــۆ ڤـــەكـــەیـــن
حـــیلا ل مللـــەتـــی نـــەكـــەیـــن
دا پـــەیـــدا نـــەبیـــت نـــەیـــاری

## ته پیرۆز بیت کوردستان[1]

تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان ئــه‌ڤ جــه‌مالــه
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان ئــه‌ڤ خــه‌ت و خالــه
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان ئــه‌ڤ بــه‌ژن و بالــه
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان ئــه‌ڤ گــول هــه‌لالــه

تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان ئــه‌ڤ دار و بــاره
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان کــانی و ڕووبــاره
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان کــه‌ڤــر و زنــاره
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان ئــه‌ڤ هــاڤین هــه‌واره

تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان دۆل و نهالــه
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان تــه‌یــر و تــه‌والــه
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان شــکه‌فــت و حــه‌والــه
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان چــه‌را کــه‌والــه

تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان بــه‌ڕۆژ و نــزار
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان کــه‌ڤــۆت و دینــدار
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان هژیــر و هــه‌نــار
تــه پیــرۆز بیــت کوردســتان گــویز و چنــار

---

[1] ئه‌ڤ هه‌لبه‌سته ل ڕێککه‌ڤتی (٢٠٠٦/٤/٢٧)ێ، ل (باتیفا - ده‌ڤه‌را گولیان) هاتیه ڤه‌هاندن.

تە پیرۆز بیت کوردستان هەلز و چەقر
تە پیرۆز بیت کوردستان سیبەر و کەڤر
تە پیرۆز بیت کوردستان پێڤوك و کەنگر
تە پیرۆز بیت کوردستان خۆ خۆشیف شەکر

تە پیرۆز بیت کوردستان لویشك و کاری
تە پیرۆز بیت کوردستان هەکدان و گێرا ماری
تە پیرۆز بیت کوردستان کڤارکێت خاری
تە پیرۆز بیت کوردستان گول نەخوین ل نزاری

تە پیرۆز بیت کوردستان هرمیك و گوهیشك
تە پیرۆز بیت کوردستان تو و بەحەشت بوونە خویشك
تە پیرۆز بیت کوردستان ماست و هەڤریشك
تە پیرۆز بیت کوردستان بۆ کوردا تۆپزیژك

تە پیرۆز بیت کوردستان نەفت و پانزین
تە پیرۆز بیت کوردستان چەنتە و پارزین
تە پیرۆز بیت کوردستان تە دوژمن ئینان لەرزین
تە پیرۆز بیت کوردستان ئەم ب تە سەربەرزین

تە پیرۆز بیت کوردستان ئەو کەهنی بهارێك
تە پیرۆز بیت کوردستان تو جانتری ژ بویك
تە پیرۆز بیت کوردستان مژمژ و حولیك
تە پیرۆز بیت کوردستان ئەو باغ و حەویك

تە پیرۆز بیت کوردستان دەنگێ شالویل و کەوا
تە پیرۆز بیت کوردستان سیبەر و هەوا
تە پیرۆز بیت کوردستان تە گیا هەمی دەوا
تە پیرۆز بیت کوردستان هەمی جهـ بەر تە تەوا

ته پیرۆز بیت کوردستان هەمی جورێت تری
ته پیرۆز بیت کوردستان شەهیدا ئاڤا کری
ته پیرۆز بیت کوردستان تو ژ هنگڤ شرینتری
ته پیرۆز بیت کوردستان تو خودان کومری

ته پیرۆز بیت کوردستان ئەڤ کەیف و شادی
ته پیرۆز بیت کوردستان یا بته گوتی ڕوبادی
ته پیرۆز بیت کوردستان نهۆ تو یا ئازادی
ته پیرۆز بیت کوردستان عەلی شاعری عادی

# چیا ڤین(١)

بۆ برایێ هێژا چیا ڤینی
هیڤیدارم ژ خودێ هەر بمینی
دا هەر هۆزانا چێکەی ڤەهینی
دا مە کوردا تێبگەهینی

ئەڤە کارەك باشە و جوانە
شرینترین پەیڤ هوزانە
هیڤیدارم باشتر بکی هزرانە
بارێ هوزانڤانا یێ گرانە

ئەی برایێ هێژا و بەرکەفتی
تو ب هوزانێ یێ پێشکەفتی
تایبەت ل ڤی چاخی ڤی وەختی
تە خەلك هشیار کر ب خەتی

تو هۆزانڤانێ ڤێ چەرخی
تو ل نك من ب بهای و ب نرخی
بۆ هۆزانی مەلەڤانی وەك کەرخی
تو چوویە پێش ئەز مام ڕەخی

ئەڤە شەش دیوان تە چاپکرن
ل کوردستان بەلاڤکرن
تە کوردستانی شاد کرن
تە دوژمن ڕەڤاندن و مرن

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٧/٦/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

بەرپرسێ لەقا ئێك دیوانا من مانە چاپكری
مـــن زۆر زەحمـــەت یــــا پێڤـــە بـــری
یـــا مـــای ل دەڤ حـــەبیبـــی[1] كـــومكری
هــــا نێزیكـــــە بكـــــەم گــــری

ئـــەز چـــو چاپخانــا ناســـم ل دهـــوكێ
وەكـــی ماســـی كـــەتـــیم شـــوكێ
ئـــــەزێـــــد خـــوینم وەكـــی تـــوكێ
ئـــــەز هــــەژارم تـــــو بخـــــۆ كـــوكێ

دڤێـــــت هـــــەر ڕێكـــــەكـــی ببینـــــی
مــــە ژ ڤـــێ تـــــەنگـــاڤیێ دەر بینـــــی
دا هوزانێـــــــت مـــــــە ڤـــــــەژینـــــــی
دا بـــــــــەلاڤ بـــــــبن ب مزگینـــــــی

ئەگەر تو دۆسكی بی ئەز ژی دوسكی مە
خزمـــــــــەتكـــــــــارێ وەلاتیمـــــــــە
تـــو دۆســـــكی ژێـــری ئـــەز ژووریمـــە
دا تـــــو بزانــــــی ئـــــەز ژ كویمـــــە

دەســـــتێ تــــە ژ یـــێ مـــــن درێژتـــــرە
قــــــەدرێ تــــــە ژ یـــــێ مـــــن پتـــــرە
ڤـــی دلـــێ شـــكەســـتی ڤـــەگـــرە
گـــەر تـــو ڤـــی بكـــەی بـــاشـــترە

(1) سیاسەتڤان و هەلبەستڤان (حەبیب كەلەش باتیفی گولی).

## باشترین سەرۆك[١]

گـــەلـــێ كـــوردا زۆر ژ مێـــژە
هـــوین مـــافێ خـــۆ د خـــازن
دیرۆكـــا كـــاوە زۆر درێـــژە
وەرگـــــرت ب پـــــارێزین

ڕۆژهـــات ئـــاقلی بچـــەمیـــنن
موئـــەســـەســـاتا دامـــەزریـــنن
فـــەقیریـــێ و شـــەرا ب ڕەڤیـــنن
نـــەبێـــژن غورڤـــە تـــەژی مێـــرن

خـــۆ هشـــیاركەن وەك كـــەوی
بـــزانن وە یێـــت هـــەیـــن هـــەوی
دوژمنـــا هـــەنـــە چـــەكـــێ نـــەوەوی
دا خـــــۆ ژێ ب پـــــارێزن

بـــبن بـــرا بـــبن ئێـــك رێـــز
بـــبن لـــەشـــكەر بـــبن ئێـــك هێـــز
دا بگـــرن قامشـــلی و تـــەورێـــز
دوژمنێـــت مـــە خـــودان گـــورزن

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٦/٢٢)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

مـــەيـــێ هـــەى باشـــترين ســـەرۆك
بـــاش گوهـــدەنـــێ دێ بـــن كـــۆك
هـوين دێ ستينن ئامـەد و كـەركـۆك
بكــەن خــەبــاتێ شــەڤ و ڕۆژ نــەڕازن

هيڤيـدارم مـرادا بـارزانى پێـك بيـنن
زانـا و كـادر خـەلكـى تێبگـەهيـنن
دا كوردێت هەر چار پارچا ڤەجەمينن
ل پێشيا مە هەنە ئاستەنگ و ئەڤرازن

ما هـەتـا كـەنگى ئـەڤ شـەڕ و شـۆقە
گەلەك مە تێكڤەدا ئەڤ تەقن و تۆقە
چاڤێـــت دوژمنـــا ل كـــوردا بلۆقـــە
وا نـەڤێـت ئـەم سـەركـەڤـين ب ئـەرزان

ريـــاد هزرێـــت تـــە د كـــوير و ديـــرن
كـــورد بۆشـــن بـــەلـــێ فـــەقيـــرن
ل مـــال ڕونشـــتينە نـــە و زنجيـــرن
بـــێ ئازادينـــــە نـــــەشـــــێن ڕازن

## خۆ هشیارکەن ئەی کوردێ فەقیر[1]

خۆ هشیارکەن ئەی کوردێ فەقیر
ل بندەستێ دوژمنا هوین مان ئەسیر
وە هۆ کرنە دەست و پێت خۆ زنجیر
خەلکێ هەمیا مافێ خۆ وەرگرت بوون جیهانگیر

ما بۆچی هوین هندە ژێك بەلاڤن بێ تەکبیر
ڕابن سەر خۆ ڕاست بکەن وەکو تیر
نەترسن ژ مرنێ خۆ ئازاد بکەن بشیر
ئەڤ کوردستانا هندە مەزن ما بێ وەزیر

نان ناهێتە بەحتن هەتا نابیت هەڤتیر
یان ب فرنێ یان ب سێلێ یان ب تەنویر
هەتا کەنگی ئەم بمینین خزمەتکار و گێژ
دوژمنا ئەم کوشتین و بەرجقاندین وەك هەژیر

دیارە وە پێ خۆشە حەپس و زیندانێت کویر
بن دەستێ دوژمنا بێ سەبەب بێ دەستگیر
کورد وەك نوکتێت ل بەریدای ژێك دویر
ل جیهانێ بەلاڤ بوون ئامان شوور و فەقیر

خەلکی چێکرن هەیڤێت ئاسمانی بێ قوسیر
مە کوردا یا هەلگرتی دەهول و زڕنا و تەمبیر
عەلی بەس بێژە بۆ کوردێت د خەو و بێ تەکبیر
ناهێت بیرا وان ئەنفال و کیمیاکرن و تەهجیر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١/٧/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## دێ هەلدەین پەرچەمێ[1]

هـــزار هـــزار ســـوپاس بـــۆ خـــودایێ عالـــەمـــێ
ســـەلات و ســـەلام ســـەر فـــەخـــرێ عالـــەمـــێ
ســـەدام و هـــەڤـــال کـــەتینـــە ل بـــەرم مـــەحکـــەمـــێ
کـــو ل هـــزرا کـــەســـێ نـــەبـــوو ڤـــێ ســـەردەمـــێ

جـــارەکـــا دی ســـوپاس بـــۆ واحـــدی[2]
کـــو دچـــن دادگـــەهـــا ســـەدامـــی مێـــر و ژنێـــت کـــوردی
دا کـــەس هنـــدە خـــۆ فـــرێ بخـــۆ نـــەبـــەت ئێـــدی
نوکـــە کـــەســـەك نینـــە ســـەر بلنـــد ژ ڕژێمـــێ

ئـــەڤ ڕژێمـــا حـــوکم کـــری سهـــ و پێـــنج ســـالا
خـــۆ کـــر قـــەســـابێ مـــەزن و بچویـــك و تـــەفـــالا
ب ســـەد هـــزار مـــرۆڤ بـــن ئـــاخکرن ب نـــاڤێ ئـــەنفـــالا
ســـەدامـــی کـــارەکـــێ وەســـا کـــر کـــو نـــەبوویـــە ل عالـــەمـــێ

بـــەلـــێ جهـــێ داخێیـــە بـــۆ دەولـــەتێـــت عـــەرەب و مســـلمانا
ل ســـەر قـــەناتێـــت تێلـــەفزیونـــا دخـــوینین حـــدیس و قورئـــانـــا
خـــۆ حســـابکەن ئـــەون مســـلمان کـــەس نینـــە غـــەیـــری وانـــا
ئەرێ بۆچـی کەسێ ژ وان دەینە کـر هەتا ب ڕێکا ئیعلامێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٨/١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] خودایێ ئێکانە.

ب سەدا کچێت کوردا هاتن کرین و فرۆتن
چو مسلمانا دەینە کر هەتا ب گۆتن
ب هزارا گوندێت کوردا وێران کرن و سۆتن
کورد دەر ب دەربوون برازای نەزانی کویڤە چو مالا مامێ

ترك و ئیران و سۆریا دبێژ ئەم مسلمانین
هەر سێ دوژمنێت کوردانە ئەم باش د زانین
ئەگەر خودێ حەسکەت دێ مافێ خۆ ژ وان ستینن
ب هاریکاریا خودێ کورد ناهێلێن بۆ وان ڤێ نزامێ

دێ نزامێ گوهۆڕین کین دیموکراتی
دا ڕۆناهی بدت هەر چار پارچێت وەلاتی
چنکو ڕۆژا مە کوردا یا هەلاتی
دێل سەر هەر پارچا بلند کەین پەرچەمێ[1]

---

[1] (پەرچەم) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (ئالا) ددەت.

# دوو هزار و پێنجێ خاترا خۆ خاست[1]

دوو هزار و پێنجێ خاترا خۆ خاست
باشی و خرابی دگەل خۆ ڤەگوهاست
کا دوو هزار و شەشێ دێ چبیت ئاست
هیڤی دارم کورد و عەراب ببن برا ڕاست

ببن حوکمەتەکا دیموکراتی و فیدرالی
پێک بهێت ژ هەمی خەلکی و هەمی ئالی
پێکڤە بژین ب براتی و ب دەلالی
دا عێراقێ و کوردستانێ ژ تروریستا بمینیت خالی

بلا حوکومەتا نوری ئەلمالکی[2] خۆ هشیار بکەت
دوزا کوردا زووترین کات چارەسەر بکەت
بلا هزرا خۆ ل ئیبراهیم جەعفەری[3] بکەت
کا چ د دەستەرێ دا هاتیە بلا وە بکەت

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٨/٥)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(2) نۆری ئەلمالکی (١٩٥٠ـ )

(3) ئیبراهیم ئەلجەعفەری (١٩٤٧ـ ).

## من باوەریا ب سەروکی هەی[1]

مالا خودێ هەر ئاڤا
هەر دوو ئیدارە بوونە ئێك
خەلك دێ لێكەت سلاڤا
کارێت وان دێ هێن بەرێك
حوکمەتا خزمەتگوزاری
ئەو باش یا دکەت کاری
خلاس نەما نەیاری
بلا بچن شەڤێت تاری
ژ ئەڤرۆ وێڤە سەرۆك
دێ کەڤیت کار و باری
بلا بزانن ئەڤرۆ دزۆك
نەشێن ب دزن پاری
من باوەر ب سەرۆك بارزانی
دێل کوردا کەت ئەرزانی
باش مەسلەحەتێ د زانی
کا چەوا دێ دەتە کوردا نانی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٠/٨/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

وەزیـــــر هـــــەمـــــی مـــــل ب مـــــل
دا نـــــەمیـــــنن قـــــەهـــــر و کـــــول
ڕۆژا حـــــــــەفتـــــــــی پێـــــــــنج
نـــــەمـــــان ئاســـــتەنـــــگ و کێـــــنج

# ئەنفالكرن[1]

سەدامی كورد ئەنفالكرن
جهـ و وارێت وان خرابن كرن
ب هزارا گوند وێرانكرن
كەل و پەلێت وان تالانكرن

چ گونەهەك مەزن بوو وی كری
كوردستانا ئاڤا وێرانكری
خودێ تولا وان ژی ڤەكری
ئەڤ كارە ناهێت ژبیركرن

نوكەیێ كەفتی كونا زیندانێ
ئەوێ مای ل هیڤیا نەمانێ
دی رەحەت بیت كوردێ كوردستانێ
فایدێ وی نادەت بەرەڤانیكرن

یێ بەرەڤان ژێت كەت گونەهكارە
رۆژا قیامەتێ وی دەعوە دار قەهارە
ل بەحەشتێ ئەوێ بێ بارە
بەرەڤانی سەر نە حەقێ ناهیتكرن

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (٢٠٠٦/٨/١٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

خودێ یا گوتی (و تعاونوا علی البر و التقوا
ولا تعـــاونوا علـــی الاپـــم والعـــدوان
چـەوا بـەرەڤـانی بیـت هوسـا (علـی الهـوی)
محـامی خـۆ ل بـەر ئـاگرێ دوزەخـێ نـاگرن

ب هـزارا وی مسـلمان یێـت بـن ئـاخ کـرین
یـا بـاش ئـەوە کچێنـت وی بـو وی بگـرین
ب سـەدا سـەدامـی ئـەمـێن سـەقـەتکـرین
نـە چـو قانوونـە محـامی خـۆ بێـت گـرن

# ١٦ى تەباخێ[1]

ل شازدەی تەباخێ　　دامەزراندنا پارتی[2]
ئەڤە شێست سالە ل کاخێ　　بۆ سەرئیخستنا وەلاتی

گەلەك نەخۆشییێت　　دیتین بۆ ڕزگاریا مللەتی
دوژمنا گوندێت سۆتین　　شەهید ببن بەحشتی

نوکە ئەم خودان پەرلەمانین　　دگەل حوکمی فیدڕالی
دڤێت ئەم باش بزانین　　باشتر ببیت یەکەتی

نەبێژن نەخۆشی خلاس　　شەڤ و ڕۆژا حەرەس بن
هەتا بەیانێت ئەساس　　کورد بکەن حوکمەتی

سەر بوورینت پارتی زۆرن　　ئەژی[3] هەمێ نزانم
بوورێت وێ گەلەك کۆرن　　کێم مرۆڤا یا دیتی

سەرۆکێ وی بارزانی بوو　　هەتا چووی نە ڕادوەستا
ئەڤ دەستکەفتە یێ وی بوو　　پیرۆز بیت وی ڕێبەری

شەڤا پارتی چێکری　　مەسعوود هاتە دنیایێ
یا خۆشبوو وەك شکری　　بۆ کوردا وەك خەباتێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (٢٠٠٦/٨/١٥)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) پارتی دیموکراتی کوردستان ل (١٦) تەباخا سالا (١٩٤٦) هاتیە دامەزراندن.

(٣) ئەز ژی.

## هزار سلاڤ[1]

هزار سلاڤ بۆ شەهیدێت مەزن و بچویك
ل بەر سینگێ دایكا بوون زاڤا و بویكی
ئینشاللا ل بەحەشتێ ببن كولیلك
ئەو بوون سەبەب كوردا گرت چویك

خەلكێ ئەوروپا باوەر ناكەن یا هاتی كرن
چونكی ئەو نەهاتنە ئەنفالكرن
یان مرۆڤ ب ساخی هاتین بن ئاخ كرن
ب سەدا مان ڤالا لاندك و دیدیك

ب هزارا عەرز و عەیال مان بێ خودان
ب دەها ل دەشت و چیا مرن ژ برس و تێهنان
هزار مخابن هولێ بێت كوردی مسلمان
سەدامی ب ڤی كارێ چەپەل ژ مەستا د خویك

هندەی كوردەك هەبیت ئەڤێ پارتێ
هەر دێ بزاڤێ كەن و كەن خەباتێ
كوردستان نادەنە چو دوژمنا نادەتێ
دێ بیت كوردستان شنگال و كەركویك

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (٢٠/٨/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

سەدامی خۆ کر فرعەونێ سەردەمی
خەلکێ عێراقێ وی خرابکر هەمی
نەفتا عیراقێ ب دزی فرۆت ب بووریا و گەمی
و ێل بەر بۆ خۆ ل سەر عەرەبا بکەت مەلیک

چ رژێما هندە پیس کەسێ نەدیتیە
هەمی ببوون دزیکەر و فەلیتە
حکومەتا هندە زالم کێ دیتە
خەلکی دیت کا وی چەند ئاڤاکرن قەسر و حەویک

# پێشمەرگە لەیلا[1] قاسم[2]

هـەر بژیـت پێشـمەرگێ هـەر دوو شـۆڕەشـا
ڕهێـــت بـــەعســـیا ژ بنـــی هـــەلکێشـــا
خودانێـــت ڕووبـــار و کـــەڤـــر و تراشـــا
ڕەڤانــدن مــرن خودانێــت عــەگــالا ڕەشــا

بژیـــت پێشـــمەرگـــێ کوردســـتانی
گوهــــــدا ڕێبـــــازا بــــــارزانی
ڕهـــا بـــەعســـی ژ بنـــی دەرانـــی
کــورد ئاشــکەرا بــوو ل ســەر شاشــا[3]

ئـــەو خــــورین وەکـــی بـــارانێ
ل ســـــەر ئاخـــا کوردســـــتانێ
دوژمنێـــت خـــۆ بـــرن ڕێـــزا نـــە مـــانێ
خـــــودانێ برنـــــو و ڕەشاشـــــــا

وان ڕوحـــا خـــۆ دەینـــا ســـەر دەســـتی
وان ئـــازادی بـــۆ کـــوردا خاســـتی
ئـــەوان مللـــەت بـــاش پاڕاســـتی
وان خـــۆ ڕاگـــرت وەکـــی پاشـــا

---

(١) لەیلا قاسم، سیاسەتڤان کورد، خەلکا خانەقینێ، ل سالا (١٩٧٤)ێ، ژلایێ حکومەتا عیراقێڤە هاتە شەهیدکرن.

(٢) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٩/٤)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(٣) ل جهەکێ دیتر: دارا ئازادیێ ب خوینێ وا ئاڤدا
زولم و سوتەمە وان رادا

وان زۆر ئـــــەڤـــــرازی هــــــەلچنــــــین
دا کوردســــــــتان ببیـــــــت جنیـــــــین
کـــــەڤـــــر و تـــــراش وان کرنــــە خـــــوین
مـــەیـــدان تـــەژی کـــر ژ تـــەرم و لـــەشـــا

پێشـــــمەرگـــەکـــا وەك لــــەیـــلا قاســـــمی
وێ دلــــــــــێ دوژمنــــــــــا ســــــــــمی
بـــــۆ دیرۆکــــــا کـــــوردا یـــــا ڕســـــمی
بـــۆ وەلاتـــی بوویـــە شـــەهیـــد وەکـــی پاشـــا

ئـــــەو کچــــــەك بــــــوو ژ خانــــــەقینــــێ
ئـــــەو نـــــە ترســـــا ژ ترســـــا خــــــەندقینێ
ئاڤــــــــدا کوردســــــــــتان بخــــــــوینێ
ئـــــەو نـــــەترســـــا ژ قـــــەلـــــەڕەشـــــا

# خاندەڤان ڕەئیسە[1]

ئـەگـەر هـەر مالـەکێ بخوینیـت
دێ نــــەزانــین ڕەڤیـــت نامینیـــت
دێــل بێـــدەرێ ئـــازادیێ هـــەلینیـــت
دێـل بـەر خـۆری بـاش هـەلمینیـت

خانـــــدن فـــــەرە بـــــۆ مرۆڤـــــا
دا نــــــەمینــــــین وەکــــــی هۆڤــــا
وەکــــی دەخلــــی ل نــــاڤ شــــۆڤا
دێ نـــــــەخۆشــــــیا ڕەڤینیـــــــت

خانـــدن فـــەرزە بـــۆ ژن و مێـــرا
دا نــــەبـــن ڕەبـــەنێـــت دێـــرا
چـــو ڕویڤـــی نـــەشـــێن شـــێرا
بـــلا چـــەنـــدی زانـــا بیـــت

خانـــــدەڤـــــان شـــــێرە
شـــــــەڤ و ڕۆژی تێـــــــرە
نـــــەخانـــــدەڤـــــان بێخێـــــرە
وەلـــــەو ئـــــەو ئاغـــــا بیـــــت

ڕوبـــاد تـــو هـــەر بنڤیســـە
خانـــدەڤـــان هـــەر ڕەئیســـە
جـــاهێلی پشـــت تـــەلیســـە
ئـــەوی خۆشـــی حـــەرام بیـــت

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٩/٥)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## صەدام[1]

سەد و هەشتێ دوو هزار جارا
سەدام بێت کوشتن و ساخ بیت
ئەوە سەرۆکێ تروریستا و گونەهکارا
تولا کوردا ژ ویڤە قەت نابیت

ئەز بۆ حەلەبچە و بارزانیا چ بێژم
ئەز بۆ دەڤەرا بەهدینا چ بێژم
ئەز بۆ سەدامێ گونەهکار چ بێژم
ب چ تەرزا ئازاد و عەفو نابیت

چاردە پێشمەرگە ب کیمیایێ کوشتن ل تویکا[2]
خودان خێزان و بابێت بچویکا
ئەرێ سەدام تو چو بووی شەرێ ئەمریکا
ڕوحا تە ژ مرنێ قورتال نابیت

تە کێمیا کر گوندێ بازێ و برجینێ[3]
تەد ڤیا کوردا وەکی توڤی بچینی
بۆ خودێ مرۆڤ بێژیت تولە عینێ
باوەرناماکەم گونەهکارەك وەك تە هەبیت

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٩/٨)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] تویکا، گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا (سندیان) ل سالا (١٩٨٨)ێ، هژمارەکا پێشمەرگەیان ب چەکێ کیمیاوی هاتنە شەهید کرن.

[3] گوندێ برجینێ سەر ب دەڤەرا دۆسکیانڤەیە.

زۆر باشـــــه خـــــودێ یـــــا ژتـــــه ســــــتاندی
ئـــەرێ مـــا کـــورد جـــەهبـــوون تـــە چانـــدی
مـــا جـــاریبوون کچێـــت کـــوردا تـــە رەڤانـــدی
بزانـــه خـــودێ دێ ڤـــی مـــافی ژ تـــە ســـتینیت

ڕوبـــاد دبێژیـــت ئـــەڤـه هـــەمـــی ل ســـەر تـــە بچیـــبن
نـــه بێـــژە ئـــەڤـــه هـــەمـــی چـــەپ و لێـــبن
دومـــاهیکێ عـــالم هـــەمـــی دی گوهـــ لـــێ بـــن
دادگـــەهـــا تـــە دێـــب عـــەدالـــەت ب ڕێڤـــە چیـــت

# نالبەند[۱] ڕەوشەنبیر بوو[۲]

ب ڕاستی نالبەند ڕەوشەنبیر بوو
بۆ هۆزانێ سولتان و میر بوو
ژبۆ خانی ئەو جێگر بوو
بۆ دنیایێ یێ ماهر بوو

کوردستان تەژی هۆزان کر
مالا کوردا وی ئاڤا کر
یا دوژمنا وی وێرانکر
بەرەڤانێ مە کوردا بوو

ڕەوشەنبیری گەهاند حەدی
ب عەرەبی و فارس و کوردی
تێت گەهشتن باژێر و گوندی
هۆزانڤانەك پەهلەوان بوو

تۆپکەری ل دەشت و زۆزان
کەسێ هندە نەگۆتینە هۆزان
ب ئەلیف و دال و هەمزان
دگەل جزیری بەرانبەر بوو

---

(۱) ئەحمەدێ نالبەند (۱۸۹۰-۱۹۶۳).

(۲) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (۲۰۰٦/۹/۱۰)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

هـــــــــۆزانێن وی زۆر درێــــــــژن
گـــەلـــەك خـــۆش و ڤـــەرێـــژن
ئـــەگـــەر كـــورد ڕاســـتی بێـــژن
ل نـــاڤ وان بـــێ بـــەرانبـــەر بـــوو

هـــۆزان دانـــان ب شـــەش تـــەرزان
وەكـــی بـــاغ و وەكـــی هـــۆزان
هـــەر پێـــنج جلـــدا[1] بكـــرە ئـــەرزان
دا تـــو بزانـــی چ ڕوســـــتەم بـــوو

یـــا باســـێ هـــەمـــی تشـــتا كـــری
ســـەد مخـــابن كـــو ئـــەو مـــری
وی لباســـــی مـــــە ڕەز و هـــــری
قوتابخانـــا گـــەلـــێ مـــە بـــوو

---

[1] هۆزانێن ئەحمەدێ نالبەند، د پێنج بەرگەیاندا چاپ ببوو.

## خۆزی[1]

خۆزی و سەد خۆزی … کوردا دیتی پیرۆزی
من نە دیت بان ب ڤی تەرزی … ئازاد ببان گوندێت ئاڤا تەزی

ئازادی مافێ هەمیانە … بۆچی خەلکی ل مە نەڤیانە
کوشتنا کوردا هۆ ئەرزانە … دیارە کوردێ بێ خودانە

ل ڤێ دنیا هندە بەرین … بۆچی ئەم لێ دەردەبرین
بۆ ژیانێ ئەم ژی فەرین … ئەم مافێ خۆ وەرگرین

یێ هەی مافێ حەیوانا … بۆچی نینە ئینسانا
هیڤیا خودێ و شێرێ مەیدانا … مەسعوود بارزانی زانا

دێ مافێ کوردا ستینیت … ب قانوون و سیاسەت
شەڤ و ڕۆژا نا ڕوینیت … هەتا کوردا بکەت دەولەت

خودێ وی ژی درێژ کەت … سەرخاترا ڤی مللەتی
دێ دوژمنا ژ مە ڤەکەت … هەر بژیت سەرۆکێ پارتی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٩/١١)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

## بلا بترسن ئەمریکا و ڕۆسیا[١]

گـــازی دکـــەم موســـلمان و كـــافرا
بـــەس ئـــەو هـــەلكـــەن ئـــاگرا
پێكفـــە هـــەمـــی ببن بـــرا
هـــەمـــی ڕێكـــا ڕاســـت بگـــرن

دا تـــازە لڤـــێ دنیـــایێ بـــژین
بـــلا بـــەس ئێـــك دوو بكـــوژین
دا نـــەبیتـــە ســـەر هـــەژیـــن
كـــەس نامینیـــت دێ مـــرن

دنیـــا ملكـــێ خودێیـــە
هـــەمـــی كـــەســـا بـــەهـــر لێیـــە
بـــەهـــرا كـــوردا ژی تێیـــە
بـــۆچی ڕێكـــا وا دگـــرن

ئـــەڤ ئـــەرد و ئـــەســـمانە
كـــێ ئـــەو هـــەمـــی دانانـــە
ل دەریـــا دەردكـــەڤـــن بركـــان
دەولـــەت بـــلا بشـــێن گـــەر مێـــرن

دنیـــا چـــەرخ و فـــەلـــەكـــە
فـــرەهیـــا وێ گـــەلـــەكـــە
دنیـــا هـــۆ بـــۆ مـــەهلـــەكـــە
نهـــۆ ڕێكـــا ل ئێـــك دوو دگـــرن

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/١١/١)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

بهێلن چەکێ مرۆڤ نەهێل
تەرك بکە ڤان کارێت بێ فێل
وە نەهێلان پیر و جەحێل
ڕێکا خودێ بگرن

مسلمان و مەسیحی
ژ ئادەمینە ئەسەحی[1]
یا گرتی بێ ئیفلەحی[2]
یا ژ باش وا ڤە ئەو نامرن

بەس چێکەن چەکێ نەوەوی
مرۆڤا دکوژن وەك کەوی
یێت ب ئێك بووینە هەوی
چو عیبرەتا ناگرن

ڕوبادی نڤیسیی ئەڤ دەرسە
نامینیت نە ڕووس و نە فرەنسە
بوسین و ئەمریکا بەسە
خۆ ل بەر مرنێ ناگرن

ئەم هەمی دێ چین فەنائێ
مە بەرهۆدا دنیائێ
کەس ل مە ناکەت
خۆ ب وەریسێ خودێ بگرن

فایدە نادەن کیمیا و ئەنترنێت
ل نك خودێ دێ بن کرێت
مە تەنگاڤی دێب سەردا هێت
ڤێ نسحەتێ[1] بخۆ بگرن

---

(١) ڕاستی.
(٢) نەباشی.

ئيران و كوريا مەهبولن
ب چەكێ كوم ژ ڤە مەشقلن
ئەوێ گۆرا خۆ ڤەدكولن
يێ عنبارا دادگرن

بترسن ژ برق و برسيا
گاڤا ژ ئەسمان ڤەرسيا
بلا بترسن ئەمريكا و ڕۆسيا
گاڤا خودێ حەسكر خۆ ناگرن

هەمی بێژن خودێ ئێكە
ئەڤە باشە خۆش ڕێكە
باشيا ل پێش خۆ فرێكە
دا بەحەشتێ وەرگرن

دنيا پويچە و بەتالە
قەت بۆ كەسێ نەمالە
بۆ كەس نابيت هەڤالە
ڤێ نسحەتێ وەرگرن

---

(١) شیرەت.

# مالا خودێ ئاڤا[1]

مــــالا خـــودێ ئاڤـــا مـــە ســـەدام دیـــت لبـــەر دادگـــەهـــێ
یـــــــێ ڕەش بـــــــووی و زراڤبـــــــووی وەك ژەهـــــــێ
ســــــەدام شـــــەش هـــــەڤـــــال دە دیــــــتن مـــــەدهــــێ
چـــون بـــەرامـــەحكـــەمـــێ وەك كـــەوا ل نـــاڤ ڕكـــەهـــێ
ســــــەدام و هـــــەڤالێـــــت خـــــۆ هـــــاتن دادگـــــەهكـــــرن
ب تاریخانـــــــا نـــــــوزدەی هـــــــەیڤـــــــا دەهـــــــێ
شـــەعبـــا عیراقـــێ ئـــەو دیـــت ب وان شـــكل و ســـۆرەتـــا
كـــەیفـــا وان خۆشـــبوو هـــەچكـــو چـــوین ســـەیرانگـــەهـــێ
ســـــەدامـــی و هـــــەڤـــالا نـــە دزانـــی ئـــەو نابـــەن دەوامـــێ
ئـــــــەو نـــــــە د ترســـــــان ژ خـــــــودێ و گونـــــــەهـــــــێ
كـــــەســـــێ وەكـــــی وان زولـــــم نـــــەكریـــــە ل مرۆڤـــــا
دێ بـــلا جابـــا خـــۆ بـــدەن ل نـــك حـــاكمی و دادگـــەهـــێ
ســـەد هـــزار جـــار ســـەدامـــی بكـــەژن تـــول ژێڤـــە نابیـــت
ناهێـــــت شویشـــــتن ژبـــــەر جـــــەریمـــــا و گونـــــەهـــــێ
وەكـــی نـــەمانـــا وان ل بـــەر قـــەزیـــا دوجیـــل تنـــێ ڕادبیـــت
ڤێجا قەزیا كوردا گەر تو تەرما ڕێزكەی دێ چن مەكەهێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٦/١١/٢٠٠٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

# گولا گەش نە چرمسینن[1]

گەلێ کوردا خۆ تێبگەهینن

گولا گەش بووی نە چرمسینن

هەوین یێ دەر و جیرانا د بینن

ئەو پیس یی خۆ د لف لڤینن

وان نەڤێت کورد خوە بینن

مافێ خۆیێ نەتەوی بستینن

ترك و فارس و عەرەب

هەر سێ یا ل مە نەڤیانە

فدرالیا مە یا لێ بووی عەجەب

ئەڤ مافە نە ب دلێ وانە

ئەڤانە ڤیانا بێ سەبەب

هەمی سویجێ ترکانە

ترك یێ خۆل کەرکووکێ دکەن خودان

ژبەر چەند ترکمانا

ئەڤە بوورین چەند قرن و زەمان

کەرکووك دلێ کوردستانا

ڤێت کورد خۆ هشیار کەن بێ گومان

دا بکەن ئێك هەر چار کوردستانا

---

(۱) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (۲۰۰٦/۱۱/۲۷)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

نوکە یا بۆ مە هەلکەفتی

بکەن دەعوە و شکایتا

بلا بەس بیت پرت پرتی

گازی بکەن دەولەتا

کورد و تو خودان نەفتی

ب فروشن حکومەتا

دا ب کوردا بکەن ئیعتیرافێ

دا دوژمن فسی کەن ناڤ شەلی

دا نەچین بەر کفنێ

دا ل ڤێ دنێ ببین بەلی

دێ خلاس بین ژ عونفێ

ئەڤە بۆ وە گۆت مەلا عەلی

# تە پیرۆز بیت[1]

تـــە پیرۆزبیـــت ســـەرۆکـــاتی شـــێرێ بـــارزان
دێـــب دەســـتێ هـــەرفیـــت پـــەیمانـــا لـــوزان[2]

ئـــەو بریـــارا کوردســـتان کـــری پارچـــە پارچـــە
دێ هلـــوەشـــینی بـــێ خـــەرج و خـــەراجـــە

ڕابـــــە ســــــەرخـــــۆ وەك ڕوســـــــتەمــــێ زاڵ
وان عـــەهـــد و پـــەیمانـــا بکـــە بـــەتـــاڵ

نـــاڤێ هـــەوە یـــێ گـــەریـــای ل هـــەمـــی جیهـــانێ
خاســـمە نهـــۆ تـــوی ســـەرۆکـــێ کوردســـتانێ

کـــوردا ب فـــەرمـــی تـــو کـــری ســـەرۆك
بـــۆ دوژمنـــا نـــەمـــان چـــوو دەرۆك

ئێـــدی کـــەس نـــەشـــێت تـــەبخـــا پینیـــت
کـــات هـــات کـــورد مـــافێ خـــۆ بســـتینیت

تـــو بـــاش هشـــیار بـــە بـــۆ مـــادێ ســـەد و چـــل[3]
باشـــــتر د بـــــەڕا هـــــەڕە هـــــۆ ژ دل

پـــەڕلـــەمـــانێ عیراقـــێ گـــەلـــەك بـــەعســـینە
مـــا دێ ســـەد و چـــل ب دلـــێ وان نینـــە

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٨/١/٢٣)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

(2) پەیماننامەیا (لوزان) ل ساڵا (١٩٢٣) هاتبوو گرێدان.

(3) مادا سەد و چل ئەو مادەیە ئەوێ د دەستوورێ عیراقێ پشتی ساڵا (٢٠٠٣)دا هاتی نڤیسین، ب مەبەستا چارەسەرکرنا دەڤەرێن کێشە ل سەر ب تایبەتی دەڤەرێن کوردنشین وەك (کەرکووك و شنگال و... هتد).

ئەو خۆ حساب دکەن کو ئەو سیاسینە
بەلێ هیچ زانین ل دەڤ نینە

بەلکی دژی کورد و فیدرالینە
ئەو ئاشق و مەعشوقێت سەدامینە

سەرۆک بلا ئەمریکا بچت پاش ببینە
کا دێ چەوا ڕێک و گولان بن خوینە

سەرۆک جارەک دی هەرە ل دەڤ ڕوینە
ڕەئیا هەمیا بزانە و بستینە

تو دزانی خائین و موخلس کا کینە
هەتا سنۆرێ کوردا ئاشکەرا نەکەن نەڕوینە

دی مستورای[1] باش تێبگەهینە
دیرۆکا مللەتێ خۆ بۆ بێژە و ڤەهوینە

دارێت بارزان هەمی تفەنگن
بەلگێت وان هەمی فیشەکن

پێشمەرگێت هنگو زۆر چەلەنگن
دێ تولا ڤەکەن و دێ جەنگن

ئەز باش یاش عەرەبا دناسم
ژ وەختێ عەبدولکەریم قاسم

ئەوان ئیعدامکر پێشمەرگە لەیلا قاسم
وەکی ترکا چ ئینا سەرێ دێرسم

---

[1] ستاڤان دی مستورا.

## ئەڤینی ـ دەلالا وەك قەمەرێ[1]

وەرە نێزیك دلبەرێ
ئەی دەلالا وەك قەمەرێ
پاڤێ پشتێ كەمەرێ
تە جان حەراجكرن ئەسمەرێ

ئەڤ خەلكە تە دین و هاركر
دلێ پیرۆز جەحێلا بریندارکر
ڤیانا تە ل هەمیا كاركر
تو زۆر بخۆ دبەی ئیفتیخارێ

هەرۆ ل بەری بەیانێ
چەندە دەرمان و كێل دوكانێ
تو دێل چاڤا دەی جانێ
هنداڤا رێ ل بەر پەنجەرێ

ئەرێ ماتو ژ خودێ ناترسی
خودانا پرچا ئەلماسی
تە بكەڤن وان چاڤا داسی
تەلمە تالانكرن جانیا بهارێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (٢٠٠٨/٣/٧)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. (قەمەر) واتە (هەیف).

تـــــو ژ بهـــــارێ جـــــانتری
کــەســێ تــو دیتــی دێ تــەمــری
دێ خازیت تو بگەهی وی هێژ نەمرێ
تـە ئـەڤ خـەلکـە قڕکـر سـاحرێ

خۆڤـــــە شـــــێرە دلبـــــەرێ
تـە ئـەم سـەردا بـرین فتنـەکـەرێ
تـــو شـــرینتری ژ شـــەکـــەرێ
چـی گاڤـا دیـن بـووم تـو ئـەگـەرێ

تـە خـەلـك کوشـت بـێ چـەك
ڕەحمـــــەکـــێ بکـــە بچـــەك
مـــن ژی یـــا هـــەی جـــەتـــەك
بـەلکـی ببـڕن پێکڤـە مـەهـرێ

# دیرۆکا کوردا درێژە[1]

دیرۆکـــا کـــوردا دیـــر و درێـــژە
ئالـــەك پـــاقژە ئێـــك قرێـــژە
خـــەباتـــا وان گـــەلـــەك ژ مێـــژە
ژبـــەر ئالوزیـــا مانـــە ل پـــاش

کوردا کەسێ خۆ ب کەسێ نەدا
لـــەومـــا کـــەفـــتن کـــول و دەردا
ئێکـــی ل دویـــڤ ئێکـــی بـــەرنـــەدا
لـــەوا هنـــدەمـــان بـــێ معـــاش

بـــوون دژی ئێـــك کـــەفـــتن کـــەلا
ئێـــك و دوو کوشـــتن بـــۆ موبتـــەلا
دوژمنـــا گـــۆت بـــاری کـــەلا
کەفتن جەنگا سۆتن گدیش[2]

وان ئێـــــك و دوو تـــــالانکرن
دوژمنێـــــت خـــــۆ ڕازیکـــــرن
وان نـە گۆت ئـەڤـەیـە خرابکرن
بـــۆ دوژمنـــا بـــۆ گـــدیش

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٨/٦/٢٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] گدیش، دەمێ گەنمی یان برنجی دکەنە گورز و ئەوان گورزان ددانن سەر ئێك دبێژنێ (گدیش).

تـــرك و فـــارس و عـــەرەبـــا

هۆســا بـــۆ وە مـــەرحـــەبـــا

دان ڕەئیســا كـــورك و عـــەبـــا

هـــەتـــا بـــۆ وان بـــوون كالـــەش

## هەوارا من تویی یا ڕەسولەڵلا[۱]

هــەوارا مـــن تـــوبی یـــا ڕەســـولەڵـــلا
ئــەز گونـــەهكـــارم گـــەلـــەك وەڵـــلا

ئـــەزێ كـــەتـــیم دەســـتی شـــەیتـــانی
هیڤیـــدارم ل مـــن بكـــە بـــەڕەڤـــانی

گاڤا ئەز مرم دێ من هاڤێن جەهنەمێ
ژ غەیرێ خودێ و تە نینە هەوار كەمێ

ئـەز فـەقیـرم تـو خـەیـرول بـەشـەری[۲]
ببــە بــەڕەڤـــان بـــۆ ڤـــی ئـــەبتـــەری

گاڤـا ئـــەز بـــرم مـــەیـــدانا حـــەشـــرێ
مـــن ژ دەســـتێ مـــەئمـــورا[۳] بینـــە دەرێ

دا مـــن نـــەبـــەن بیئســـەلمـــەســـیرێ[٤]
ئـــەز خـــۆ نـــاگرم ل بـــەر زنجیـــرێ

چنكـــو ئـــەز زەعیـــف و بـــەلنگـــارم
ئـــــەز هێڤیـــــێ ژ تـــــەت[۱] خـــــازم

---

[۱] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٨/٧/٦)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[۲] باشترینی مرۆڤانی.

[۳] كارفەرمانا.

[٤] پیسترین جهی.

من عەمەل پیس و خرابن
ب ڤان عەمەلا ئەمێ ووندابن

ئەگەر بۆ مە نەکەی شەفاعەقێ[٢]
ئەم دێ بین پیسێت ئوممەتێ

ئەز فەقیر و بێ چارەمە
ئەز هەژارێ ئوممەتا تەمە

تو شافعی بۆ گونەهکارا
تووی هاریکارێ هەژارا

تووی پەیغەمبەرێ ساحب رسالەت[٣]
نەبی بەرەڤان دێ بین خوسارەت

ئەز بۆ دینی بێ ڕەواجم
بۆ ڕێکێ بێ خەرج و خەراجم

ژ باشییا ئەز حەراجم
هیڤیدارم بکە عیلاجم

من ئیمانا ب خودێ هەی
من یەقینە من ژبیر ناکەی

دێ بەرەڤانێ ژ مە کەی
من ئیمانا ب تە ژی هەی

---

(١) تە د.

(٢) بەرەڤانیێ.

(٣) خودانێ پەیامێ (پێغەمبەراتیێ).

هیڤیـــــــــــدارم ژ ڕەحمـــــــانی
عـــەفـــوا خـــۆ ل ســـەر مـــە دانـــی

تـــو شـــافعێ مـــە هــــەمیـــانی
ئازادکـــە کـــورێ تـــەتـــەخـــارنی[١]

[١] مەلا عەلی کوڕێ تەتەرخانی، هەلبەستڤانێ ڤی دیوانێ.

## هندی مرۆڤ بخوینیت[١]

هندی مرۆڤ بخوینیت     هەمی زانینێ نا ئینیت
چەندی خۆ ب وەستینیت     نەزانین هەر دێ مینیت

عیلم دەریا بێ بنە     هەمی کەس ناگەهنێ
نە خاندن ژی دوژمنە     دڤێت پشتێ نە دەنێ

چەند مرۆڤ زانا بیت     هەنە ژ مرۆڤی زاناتر
مرۆڤ هەر دێ پێتڤی بیت     بۆ زانینەك دیتر

مرۆڤ دچن عەسمانا     دا پەیدا کەن زانینێ
هزار قڕن و زەمانا     نائینن هەمی زانینێ

یێ هەم یێت زانیت خودێیە     کەس نینە وەکی وی بیت
خەلك و هەوە گوهـ لێیە     مە حالە کەس وەك خودێ بیت

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٨/٧/٦)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## ژیانا وەك هەژارا[1]

کول و کۆڤانا ئەز کوشتم
ئەز د عاقلێ کوردا نەگەهشتم
وان ئەز دین و هار کرم نەهشتم
بەردام چۆل و بەیارا

ئەز نزانم بۆچی خۆ تێناگەهینن
شەڤ و ڕۆژا بت بتە و دو ڕوینن
نەشێن ئێك دوو تێبکەهینن
خۆ خلاسکەن ژبەر شەق و دارا

هەڕۆ وێل بەر شەق و مستا
نەشێن بلندکەن دەستا
ژیانا وان ل گرتیخانا و خەستا
نەشێن سەری بلندکەن ل بەر نەیارا

ڤێجا چەوا مرۆڤ نەبوو هژیت
کو کوردەك نەشێت ب لەپژیت
کو ل سەر ئاخا خۆ ئەو بژیت
هەردەم وی نالە نالە وەك بریندارا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/١/٣١)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

مـــا هـــەبوونـــا وی کـــوردی بۆچیـــە
ڕۆژا ڕۆنـــــــاهی ل وی تاریـــــــــە
چـــو کـــارا ناکـــەت چـــی بـــە چیـــە
هـــەر خزمـــەتکـــارە بـــۆ دوژمـــن و نـــەیـــارا

وەڵڵاهـــی ئـــەز مـــام عـــەجێـــب گرتـــی
ژێـــەر ڤـــی مللـــەتـــێ پـــرت پرتـــی
وان بێـــت چێکـــرین ســـەد پـــارتی
بـــۆچی هـــوین هـــەمـــی نـــابن بـــرا

دەنگێ خـۆ بکـەن ئێـك بکـەن گـازی
دا مـــافێ خـــۆ ژ دوژمنـــا بخـــازی
دا مللـــــــەت ژ وە ببیـــــــت ڕازی
دا بـــەس بچـــن ل پـــەرقنـــارا

مـا هـەتا کـەنگی سـەرشووڕی و کرێتـی
هـــوین ڕاوەســـتاینە وەك کێتـــی
نـــێ دوژمنـــا تـــو یـــێ مێتـــی
هـــەی ســـەرشـــووڕێ ل بـــەر دیـــوارا

کەنگی مللـەتەك سـەرکـەفتیە بێ خـەبات
ئـەز نـزانم هنـدەك سـاڵە چـەوا خـەوا وەهـات
ئـــەڤ کوردســـتانا پـــڕ خێـــر و خێـــرات
وە هـــێلا بـــۆ دوژمـــن و نـــەیـــارا

نـــێ وە ڕپـــاد[1] هـــار و دیـــن کـــر
هنـــدی وی نـــەســـیحەت بـــۆ وە کـــر
وە پشـــتا خـــۆ دایـــێ وە گوهـــ لـــێ نـــەکـــر
وە پیـــرۆز بیـــت ئـــەڤ ژیانـــا وەك هـــەژارا

(1) ڕوباد، ناسناڤێ هەلبەستڤانێ ڤێ دیوانێ یە.

# کورد ئێدی ناهێن خاپاندن[1]

کوردستان دلڤەکەرە
بۆ جانێ خۆش دلبەرە
بۆ ژیانێ وەك شەکەرە
ل سەر وێ بووم دەربدەر

من قەبوول بوو دەربەدەری
دێ بم زێرەڤان ل بەر دەری
دابکەم بویك دا بچم سەری
بلا ڕوحا من بێتە دەر

دلبەرەکا شۆخ شەنگە
ئەو گەلەکا ب ناڤودەنگە
نەیارا بۆ نەهێلا ڕەنگە
عەرەب و ترکێت دل کەسەر

عەلی یە قوتابێ خانی
یێ نالبەندی و بارزانی
وێ ڕێبازا وا یا زانی
بۆ چو دوژمنا نە مایە مەفەر

یا سەدامی دگەل کوردا کری
نەکێمتر بوو یا هێتلەری کری
بۆ هەر دووکا مان کول گری
کوردا ڕاکر ئالایێ زەر

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٣/١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

کـــورد ئێـــدی نـــاهێن خاپانـــدن
ل ســـەر خـــەبـــاتێ ئـــەو تونـــدن
نـــا بـــەردەن کوردســـتانێ تـــا مـــردن
بـــلا ســـەد جـــارا بـــبن دەربـــدەر

بـــارزانی ڕێـکـــا نویشـــا وانـــدای
دێ هــــــەر میـــــنن نــــــە لادای
دوژمـــــن دێ کـــــەن ئـــــای و وای
کــــــوردێ وان کــــــەنــــــە دەر

# کەس دلێ خۆ بدنێ خوش نەکەن[١]

کەس دلێ خۆ بدنێ خۆش نەکەن
گەلەك تاعەتێ بۆ خودێ خۆ بکەن
بلا کارێت حەلال هوون بکەن
دا ژێ دەرکەڤن ب سەر فەرازی

تو تێدا بمین هزار سالا
تو ناگەهی چو مراد و خالا
تو دێ مری ژێ دەرکەڤی ڤالا
تو خودێ ژ خۆ بکە ڕازی

خۆ دویر بکەن ژ وەسواسێ
گوهـ نەدەن ڤێ دنێ بێ ئاساسێ
باش خودێ خۆ ڤێت بناسێ
ل پێش هەمیا هەیە دادگەهـ و ترازی

چیا مەکری یا ب حسابە
خۆ دویر بکەن ژ کارێت خرابە
قیامەت یا ب ترسە بێ ئینسیحابە[٢]
د گوریدا مە مەلەك دێل مەکەن گازی

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٣/٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] خوە ڤەکێشان.

مانا مە ل دونیائێ بۆ ئێمتیحانە
نە بەس بۆ خارن و ڤەخارنانە
کا دێ بین کافر یان خودان ئیمانە
ببە خودان ئیمان دانە ئالزی

یارەب تو مە بگێڕی ژ قەنج و باشا
تو مە نەکەی ژ هەبلە تراشا
تو بدەی مە سیبەرا عەرشا
شەیتانی ژ مە ڤەکەی ئەوی بەرازی

شەڤ و ڕۆژ وی کار فەسادە
دگەل موسلمانا خودان عنادە
ئەم هیڤیدارین وی ژ مە لادە[1]
دا سەر کەڤین ل ڤی ئەڤرازی

مە دەربازکە ژ پڕا سیراتێ
ل سەرا بچین وەکی میقاتێ[2]
ل مە دویرکە گاڤا هەی هاتێ
تڕازیا تەیە باشتر ترازی

ئەڤە ڕوبادی هیڤی ژ تە کرن
گەلەك داخاز وی ژ تە کرن
هیڤیدارە خەلك وەرگرن
شەیتانی ژێ دویرکە ئەوی جەنبازی

---

(١) بدە ڕەخەکی.

(٢) نە ڕاوستیای.

# ئەو چێکەرێ ئەم چێکرین[1]

ئـــەو چێکـــەرێ ئـــەم چێکـــرین
ڤێـــــت بـــــزانین ئـــــەو کییـــــە
بـــــۆ وی ببـــــین شـــــاکرین
بـــــاش بـــــزانن خودییـــــــە

چـــو تشـــت نابیـــت وەکـــی وی
ئـــەو نـــە وەکـــی کـــەسێ یـــە
کـــەس نابیـــت بـــەرامبـــەری وی
کـــەسێ هێـــزا وی نییـــە

بکـــەن هـــزرا ل کـــارێ وی
کـــا کـــی دشـــێت وەکـــی وی
بـــەرێ خـــۆ بـــدەت عـــەسمانێ وی
چ کـــارەکـــی ســـپەهییـــە

بـــەرێ خـــۆ بـــدە ئاخـــا وی
کـــا کـــی هـــەیـــە شـــپهی وی
دائـــیم بکـــەن شـــوکرا وی
رێکـــــا وی رۆناهییـــــە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٩/٣/٧)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

بەرێ خۆ بدەن ڕووبارا
ڤان چیا و دار و بارا
ئەڤان دەشت و بیحارا[1]
کەسێ ئەڤ فکرە نییە

چەند ئەڤ عالەمە ببن ئێک
زانیبا خۆ بکەن ئێک
نەشێن چێکەن یەک هێک
ئەڤە من گۆت ڕاستییە

چێکەرە بۆ ساخ و مریا
وی دانان ئەرد و دەریا
نەزەر کەن حێشتر و مویریا
کا هێزا کێ وەک وییە

بەرێ خۆ بدەن بیحارا
مەخلوقات ب ملیارا
نەشێم لێدەم ئەخبارا
کار هەر کارێ وییە

---

(1) دەریایان.

# بەحشت گەلەك یا خۆشە[1]

بەحشت گەلەك یا خۆشە
خوزی ئەز چووبامێ
دوزەخ گەلەك نەخۆشە
خۆزی ئەز نەچوو بامێ

بەحشت چ بەحشتە
یا تژی هەمی تشتە
جهێ سەیران و گەشتە
دێ حاسل كەت مەرامێ

چێ تشتێ تو بخازی
دێ وەرگری ب شانازی
تو تێدا نا ئالزی
تو دێ بینی نزامێ[2]

تو دێ بینی سیبەرێت مەزن
حەفتێ خەریفا[3] سووار ببەزن
خلاس ناكەن چەند ببەزن
چی تشتێ تو بخوی تێر نابی ژ تامێ

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٩/٣/٧)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) ڕێكوپێكیێ.

(3) پاییز.

بـــەحشـــت ب تاعـــەتـــی تێـــدکرین
ئینشـــائەڵـــلا بچینـــێ گاڤـــا د مـــرین
دڤێـــت ئـــەم بـــۆ حـــالێ خـــۆ بگـــرین
دا ئـــــەم نـــــەچـــین جـــەهنـــەمـــێ

خۆزیـــا وی کـــەســـێ بـــەحشـــت کـــری
ئـــــــەوێ ترســـــــای ژ ئـــــــاگری
زانـــــی کـــــەس خۆلبـــــەر ئـــــاگری
ل بـــــەر روی ئـــــاگری و گـــــەرمـــێ

ڤێـــت مـــرۆڤ بـــاش خـــۆ چێکـــەن
باشـــییا ل پـــێش خـــۆ فرێکـــەن
بـــــۆ باشـــــییا لـــــەزێکـــــەن
دا ژ خـــــودێ نـــــەکـــــەن شـــــەرمـــێ

ئـــــەڤ دونیایـــــە لـــــەعابـــــە
موســـــــلمان تـــــــازە رێ راپـــــــە
کـــــەســـــێ گوهـــــداریێ خرابـــــە
مـــــرۆڤ مـــــا تـــــو بـــــێ فـــــەهمـــێ

ل ڤـــــێ دنـــــێ مێهڤـــــانین
نـــــە لازم مـــــالێ بـــــاش دانـــــین
باشـــــە مـــــا ئـــــەم نـــــزانین
دا ژ خـــــودێ ب خـــــازین رەحمـــێ

# گەلی خەلکی وەرن دا بخۆ بکەین گری[1]

گەلی خەلکی وەرن دا بخۆ بکەین گری
ل سەر وان کارا یێت مە کری
دا خودێ مە نەبەت ئاگری
بەلکی مە بکەت بەحشتی

خوە هشیارکەن مە هایش خۆ نینە
ما هوین نا بینن هەرو قێری و گرینە
هەوار ئەڤە چیە چ نینە
دێ بێژن فلان کەس بۆ مشەختی

دێ بێژن فلان کەس مر
بەلێ ل گەل خۆ نەبر
دەیندارا گەردەنا وی ئازا نەکر
ئەوی بخۆل خۆ کر بێبەختی

قەت چو کار ناجن بەلاش
هشیاربن کەس خۆ نەکەن شاشی
باشیا بکەن بۆر و پاش
دا هوین نەکەڤن زەیقەتێ[2]

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٩/٥/١٠)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) بەرتەنگیێ.

چــــو تشـــــتەك بــــــەرزە نابيــــــت
چيـــێ گـــر بيـــت يـــان ژى هـــوير بيـــت
قيامـــــــەتــــــێ دێ حـــــازر بيــــــت
كـــێ دێ بـــۆ كـــەت شـــەفاعـــەتـــێ

گـــەلـــى خويشـــك و بـــرا دنيـــا وارە
خـــۆ هشـــياركەن شـــەيتـــان نـــەيـــارە
بـــاش هشـــيارين نـــەفســا مـــە ژى نـــەيـــارە
بـــــاش بترســــــن ژ ڕۆژا قيامـــــەتـــێ

بخـــــــوبگرن ڕێكــــــا دينـــــــى
ژ عـــــــەمـــــرێ زێــــــدە نـــــامينى
خـــەلكێـــت مريـــت تـــو بێـــت بينـــى
بگــــــرن ڕێكــــا هيدايـــــەتــــى

## مخابن بۆ ئەڤی دینی[1]

مخـــابن بـــو ئـــەڤـــی دینـــی
بـــۆ نـــە مایـــە چـــو لاوینـــی
خـەلکێت مریت تـو وێت[2] بینـی
بـەرێ خـۆ بـدەن ڤـەگـەڕهـانێ

شـــەرمـــە بمـــری تـــو بـــێ نڤێـــژ
ئـــەڤـــی لـــەشـــی و قرێـــژ
دێ پیســـــتری ب گـــورێ هێـــژ
دێ ژ کـــێ خـــازی تـــو ئـــەمـــانێ

ل گـــورێ نینـــە هاریکـــاری
تـــو دێ کـــەڤـــی زکـــێ مـــاری
ل وێ گـــورا تـــەنـــگ و تـــاری
تـــو دێ ل وێـــرێ مینـــی تنـــێ

دێ هێـت تـە منکـەر و نـەکیـر
دێ پسـیارا ش[3] تـە کـەن هـویر
تـــە تشـــتەك ناهێتـــە بیـــر
دێ بـــێ ئێخســـیر ل زینـــدانێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٥/١٧)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] یێت.

[3] ژ.

تــو ل ســەر دنــێ ژ خــۆ ڕازیبــووی
ل خــودێ خــوی تــو غافــل بــووی
دێ هـــەڕە تـــو مـــری و چـــووی
بکـــەڤـــە بـــەر زەڕب و لێـــدانێ

ژ تـــە ناهێـــت بـــەڕەڤـــانی
نوکـــە تـــو خارنـــا کرمـــانی
چنکـــو تـــە گوهـــدا شـــەیتـــانی
تـــە خـــۆ دویرکـــر ژ ئیمـــانێ

تـــە ل ســـەر دنـێ خـۆ د سـەردا بـر
تـــە هـــزرا ڤـــی ڕۆژێ نـــەکـــر
لـــەوا گـــوڕا تـــە بـــۆ ئـــاگر
تـــو ڕەزیـــل بـــووی ل مـــەیـــدانێ

تـــە ل ســـەر دنــێ باشــی نــەکــر
تـــە حیلـــە ل ڕوحـــا خـــۆ کـــر
تـــە پویتـــە ب دینـــی نـــەکـــر
تـــا تـــو ســـەردا بـــری دنـــێ

## عەزیزێ دلبەرێ بویکێ [1]

عـــەزیـــزێ دلبـــەرێ بـــویکێ
دیـاره خـەلکـێ کـەرکـویکێ
تـو بوویـه زیـڕ کـەتـی سـویکێ
بـــێ تفـــاقی کـــەت توجـــارا

کـەسـێ نـەشـیا تـه بگریـت
کـەسـەك نـەشیا تـه هـەلگریـت
تـو ئـاگری تـو یـێ کپریـت
تـــو یـــا بـــەر بـــی نـــەیـــارا

تـو ل بـەر دلـێ مـن دلبـەری
تـــویی حـــوری تـــویی پـــەری
تـــه کـــەس نینـــه بـــەرانبـــەری
تـــه وینـــەکـــەت نـــاڤ دەڤتـــەرا

تـــه دەنـــگ ڤـــەدا پتـــر ژ زینـــێ
نـــاڤ دلادا وەکـــی خـــوینێ
بـــۆ مـــه کـــوردا خـــەســـتا ژینـــێ
تـــــوی دەرمانـــــا برینـــــدار

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٦/١١)ێ، ل (باتیفا - دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

دلبـــەرا مـــن تـــو خۆشـــكۆكێ
گـەلـەك جـان و گـەلـەك كـۆكێ
تــو هشـــيار بــە نــەكــرو شـۆكێ
خـــۆ بێخـــى دەســـتێ نـــەيـــارا

تـــوى لـــەيـــلا ئـــەزم مـــەجنـــوون
دوژمنـــــا ل بـــەرە مـــە بخـــوون
لـــــەوا مــــن دل پـــرە ژ خــــوون
دكــــــەم گــــازى وەك هـــــەوارا

## ئەز کەتم بن بارێ سیاسەتێ[1]

ئەز کەتیم بن بارێ سیاسەتێ
شەڤ و ڕۆژا مە خەو نەتێ
کەنگی دێ بینن فرسەتێ
کورد خۆ بگەهینن حوکمەتێ

ئەڤ سیاسەتا پرت و بەلاڤ
نە دایە و نە باب بێ سەروچاڤ
کورد ل جیهانێ کر بەلاڤ
هیڤیا من شاهێ قودرەتێ[2]

هێڤیا من شاهێ زولجەلال
کوردا هەمیا بکەت هەڤال
کوردا بکەت دەولەت و مال
دا ئەم ببینین ڕاحەتێ

ئەم جەحێل بوون ئەم پیربووین
ئەم د ڕاستبووین ئەم خویلبووین
ئەم نێزیک بووین ئەم دویر بووین
خودێ بدەت نەسرەتێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٦/١٤) ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] خودایێ مەزن.

# جەژنا نەورۆزێ[(١)]

گەلێ کوردا مزگینیێت نەورۆز هاتەڤە
جەژنا هەوەیە پێشڤە ڕابنەڤە

ئالایێ کوردستانێ هنداڤ پەرلمانی ڕاکەنڤە
ڕۆژ ب ڕۆژ خۆ ڤەشدینن دا نەکەڤە

دیرۆکا ئەڤێ جەژنێ زۆر یا درێژە
ئەڤە دوو هزار و حەفسەد ودەهـ سالە

هەتا نوکە سەربەست نەبوویە بێ ڤەرێژە
دڤێت کورد هەمی بۆ وی ببن پالە

بەری عیسای ب حەفسەد سالا یا هاتیە کرن
کاوەیێ کورد هنگی بۆ دوژمنا یا ئینای مرن

هەمی ئاری ئەڤێ جەژنێ دکەن پیرۆزی
ئەم کورد ژی ئارینە ڤێت بکەین ب دلسۆزی

ئاریا حاکمەك زاڵم و زۆردار هەبوو
زێدە بێبەخت و چو مرۆەت وی نەبوو

زوڵما وی موجرمی وەکی یا سەدامی بوو
مللەتێ کورد یێ بێ هەوار و گازی بوو

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی(٢٠/٣/٢٠١٠)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن. هەلبەستڤان دبێژیت: " بۆ ئاگەداری چەند برگەکێت نالبەندی د ناڤ ڤێ هۆزانا مندا هەبوون گەلەك د کێم بوون ـ ئێدی سوپاس بۆ هەوە".

جارەكێ ئەڤ حاكمە كەتبوو نەساخ
زوڵمەكا زێدە ئەوی دكر ئاخ و ئاخ

چو دەرمان بۆ حاكمی پەیدا نەبوو
نوژدارەك بۆ چۆ ژ ئەسلێ تركی بوو

گۆتێ دەرمانێ تە دزانم بەلێ ب زەحمەتە
گۆتێ بێژە چیا تە بڤێت دێ دەمە تە

گوتێ دەرمانێ تەیە خوین و مەژی
یێ سەرێ تۆلاز و لاوا دا یی بژی

ضەحاك ڕابوو تیق تیق بەردا كەنێ
گۆت ئەڤ دەرمان زۆرە دێب سەرێ لاوا كەم هولانێ

ضەحاك ڕابوو سەرخۆ ویل سەرێ كوردا كر دورانێ
هەڕۆ ئێك دوو ئینان قەسابخانێ

ضەحاك ڕابوو لەزكر وەكی هۆڤا
وی دەرمانێ خۆ كر خوین و مەژیێ مرۆڤا

مللەت ب هزارا ڕەڤین چوونە چییا
بۆ بەڕەڤانێ كەس نەبوو كەس نەشییا

ژ برسا دا ئەوان خارن چولی و گییا
ئەگەر وان مرۆڤە دیتبا دا ژبەر ڕەڤن وەك كویڤییا

هەتا كاوە ڕابوو سەر خۆ ئو ئەو شییا
وی شۆڕەش ڕاكر وی ئاری ئێخستن خۆشییا

مللەتێ كورد ژبەر وی كەتبوون دادەكێ
قەت كەسەك نەشیا بكەت ئینادەكێ

ڕابــوو ســەر خــۆ لاوەكــێ كــورد كــاوە بــوو
كــارێ وی حـــەدادی بـــوو خیـــرەت هـــەبـــوو

ڕابـــــوو ئـــــەو حـــــاكم تـــــازە كوشـــــت
ژبـــۆ خـــاترا مللـــەتـــی خوینـــا وی ڕشـــت

كــاوەی ل نــاڤ مللــەتــی كربــوو مشــێوەرەت[1]
گاڤــا مــن ضــەحــاك كوشــت ئــاگرە ئیشــارەت

كــاوەی چــەكــوچ هــەلگــرت ســەركــەت ســەرایــێ
چــو هنــداڤ ضــەحــاكی گــۆت تــو چــەوایــێ

گۆتێ تــو خــلاس تــو چــووی كــەتــی بــەر بــەلایــێ
عــەمــرێ تــە چــوو ئــو خلاســبوو ئــو نــا ئــێ

كــاوەی ئــەو چــاكوچ ل ســەرێ وی هــەلفرانــد
مــەژی دگوهــا دا هــات و خــۆ هــەل پــەڕانــد

ضــەحــاكی خــۆ ڤــەژەنــی ڕوحــا وی ژ بنــی دوراند
پێبكــێ وی گــرت ول قــەســرێدا هــەلفڕانــد

كــاوەی كوشــت ئــەو زاڵمــێ شــەلــەولــە
مللــەتــی ئــاگر هــەلكــرن كــرن مــەشــعەلــە[2]

ژ هنگــی هــەتــا نوكــە ئــەو ئــاگر هــەلــە
ئاهــا ب ڤــی تــەرزی كــاوەی موشــكیلە كــر حــەلــە

هــزار سلاڤ ل ســەر ڕوحــا شــەهیــدێت كوردســتانی
خــودێ بهێلیــت كــاوەیــێ ســێیەم مــەسعوود بــارزانی

ئــەو بــاش دزانیــت حــەق و حقــوقێ ئینســانی
خــودێ ڕەحمــەتــا خــۆ دارێژیت گــوڕا مستــەفا بــارزانی

---

[1] شێوەرمەندی.

[2] خەتیرا.

# هزار و نەه سەد و هەشتێ و هەشتێ[1]

هزار و نەه سەد و هەشتێ و هەشتێ
بۆ سالەکا کورد قران
کوردستانا وەك بەهەشتێ
سەدامی کر خراب و وێران
ل سالا کورد قڕانێ
ڕەڤیم چوومە ئیرانێ
وی ڤەکر دووکانا قەسابخانێ
بۆ خەلکێ کوردستانێ
سەد و هەشتێ و دوو هزار
مرۆڤ بن گوڕکرن
بێ سەبەب و بێ قرار
نێر و مێ تێك هەلکرن
سەدامی کورد نەنفالکرن
ب ساخی وی بن ئاخکرن
دەولەتێت موسلمانا
کەسێ نەگۆت خرابە
خاسمە دەر و جیرانا
نە گۆت ئەڤە عیتابە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠١٢/٢/٣)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.
ژبەر نەبوونا ناڤونیشانی، دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

دیارە کو ب دلێ وابوو
لەوا کەسێ دەیننەکر
جیهانێ هەمێ گولێ بوو
دەین نەکر و خۆ مت کر

کورد هەمی بوون مشەختی
ڕەڤین چوون دەڤ جیرانا
ل کوردا کر بێ بەختی
چوونە ترک و ئیرانا

سەدامی کێمیا ژ کێ کری
ئەوا ب کوردا وەرکری
هویر و گر بەر باد کری
کەسەك بۆ وان نەگری

دەولەت هەمی مەسلەحینە
درەوە نە دیموکراتینە
کی گوهێ خۆ بدەت وان دینە
نیەتا تاوان نەفت پانزینە

دەولەت هەمی شەڕخازن
درەوە نە ئازادی خازن
مللەت مافێ خو د خازن
مامانێ وان کێمیا و غازن

نێزیکی چل مەلیۆن کورد
نوکە بێ ناف و مافن
ب هزارا بازاڕ و گوند
خرابن و بێ مرۆڤن

ما کوێت چبوو بۆ دەولەت
چنکو هەبوو نفت و پانزین
ئینگلیزی کر دەولەت
بۆ ئەم کورد بەلنگازین
شێخ مەحموودی[1] کر شۆڕەش
ئینگلیزی شەڕێ وی کر
دا کوردستان نەبیت گەش
ئینگلیزی بنبڕکر
نوکە یا ل کوردستانێ هەی سەفارەت
دا قوسیریا خۆ بەرزەکەت
وی ل دەڤ من نینە بەرائەت
خۆ ئەو مە بکەت دەولەت
ئەڤە شەعبا فەلەستینێ
ئەو ژی مافێ خۆ دخازیت
کار چێنابن بنە هیسنێ
دێ مافی خۆ پارێزیت
ئەو ژی شەعبەك مەزلومە
دڤێت ببیتە حوکمەت
دیارە مەعلوومە
دژی وانە سەهیونییەت
گەر کورد ل سۆریا نەبان
نوکە شەڕ ڕاوستا بوو

---

[1] شێخ مەحموودێ بەرزنجی (مەلك)، پشتی چەندین سالێن تێکۆشانێ، ل سالا (١٩٥٦)ێ، مالئاڤایی کر.

وان ژی یا هەی کوردستان
لەورا هۆسا خراب بوو
گەلی کوردا خۆ هشیارکەن
سەرێ خۆ ب ئێك و دوو ڕاکەن
بەلاڤوکا هوین بەلاڤکەن
پاشی دەولەتا خۆ ئیعلانکەن
خۆ هشیارکەن باش و باش
خۆش ئێك و دوو نەدەن پاش
دا خەباتا وە نەچیت بەلاش
دێ دوژمن خۆش دەن پاش
مەزنا بۆ مە گۆتی
هەرە شۆل ب دەستێ خۆ
مە کوردا یا خۆ سۆتی
دا هەلکەن ئاگرێ خۆ
هەر چار تەرەفا پێکڤە گرێدەن
ڕاپورتا واژووا لێدەن
بورپێت نەفتێ پێکڤە گرێدەن
بۆ بکرا فرێکەن

# شەهیدێ زیندی[1]

ئــــەز بــــووم شــــەهیــــدەك زینــــدی
ل هــەمــی ژیانــا خــۆ مــن خۆشــی نــە دی
مــن ئــەركــێ خــۆ گــەهانــدە حــەدی
ئـەزێ مـایم ل هێڤیـا مرنـێ ل نـاڤ لـەحدی[2]

ئــەز نــە پێشــەمــانم خزمــەتــا مــن كــری
چنكو مـن خزمـەتـا وەلاتـێ خـۆ یـێ كـری
مـە دەرئێخسـت ئـەو دوژمنـێ ئـاخ داگیركـری
مـە ئـالایێ كوردسـتانێ هـەلـدای و بلنـدكری

سـەرۆك بـارزانی ئـەڤ ئاڤـە یـێ دای خانـەنشینا
حـەقیقـەت گـەلـەك وی كـەیفـا مـە ئینـا
ئــەو دزانیــت مــە عــەدەمــا[3] دوژمنــا ئینــا
مــە كوردســتان ل بــن دۆســت وان دەرئینــا

ئــەو ئــەم حوكمــەتــە كــین فیــدرالی
یــا بــی ئــازادی یــا ل دوژمنــا مــای خــالی
ل ســەر كوردســتانێ نوكــە ئــەمــین والــی
بووینـە خـودان پـەرلـەمـان و وەزارەت ب دەلالـی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێكەڤتی (٢٠١٢/١٢/١)ێ، ل (باتیفا ـ دەڤەرا گولیان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] گور.

[3] چ تێنەهێلا.

ل پـــێش دوژمناڤــــه ســــەربلنـــــدین
یـەك بوهســتا ئـاخێ ل دویـڤ وان بـەرنـادین
مــە قـــەلعــە و ڕەبییێـــت وان هـــەڕفانـــدین
مـە ئـالا كـوردا ل سـەر دائێـرا لـەقانـدین

یـا مـای كـەركـووك و شـێخان و سـنجار
بـەعـزەك[1] ژ خانـەقـین و دیـالا و كـەلار
مـــادێ ســـەد و چـــل یـــا دای قـــەرار
كـو ب گـەریـێن ڤـە چـپ تـەنـاهی یـان بنـار

ل پێنجـی و هـەشـتێ ئـەز بـووم حزبـی
ل سـێ هـزارێ ئـەز بـووم خـودان تزبـی
مــن خـــۆ نـــە دیـــت ڕۆژەك كزبـــی
ســـوپاس بـــۆ خـــودێ نـــەبـــووم حزبـــی

ڕوبـــــاد تـــــو مرۆڤـــــەك دلســـــۆزی
تـــو خـــەباتكـــەر و خـــودان ســـۆزی
ل ســـەر ڕێكـــا بـــارزانی هـــەڤ ســـۆزی
تـــە پیـــرۆز بیـــت خـــەبـــات خـــودا دۆزی

---

[1] هندەك.

# ئەڤە ڕەمەزان هات[1]

ئەڤە ڕەمەزان هات
زێدەکەن خەبات
ئامادەبن ل زکر و سەلات
دا ببینن ئیفلەحێ

هەیڤەکا پڕ قیمەتە
بخۆ بگرن خۆش فورسەتە
قورئان تێدا هات حەقیقەتە
ببن ئەهلێ ئیسلاحێ[2]

کەسێ بگریت ب باوەری
قەبرێ وی نابیت تاری
دێ چیت بن حەڤزا جەباری
دێ بێ خەلکێ نەجاحێ[3]

هەر شەڤەک حەفتێ هزار
دێ ئازادبن ژ نار
ب فەرمانا ڕەبێ قەهار
دێ بن ئەهلێ فەلاحێ

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) باشیێ.

(3) سەرکەڤتن.

ڕۆژی دێ بیـــــــت پاراســــــــتن

ژ ئـــــاگرێ جـــــەهنــــەمـــێ

ژ نـــــەخۆشـــــیا ڤـــــەڕســـــتن

دێ چـــن بـــەر ڕۆناهیـــا میســـباحێ

شـەڤـا چـەلانـێ هنـدی هـەمـی شـەڤـا

دێ ئـــــازاد بــــــن ژ ئـــــاگری

هـــــەمــــــی دێ بنـــــە زاڤـــــا

ل بــــن خیڤـــــەتێـــــت ســـــاحێ

## هزار جار بۆ سەدامی لومە[1]

هـــزار جـــار بـــۆ ســـەدامـــی لۆمـــە
مـــــرۆڤ كوشـــــتن كومكۆمـــــە
چ مرۆڤـــــەك خـــــراب و شـــــۆمە
وە نەزانی كورد خۆڕاگرە و ب دوومە

ســـــــەدام ناڤـــــــەك شـــــــەڕارە
ل نـــــاڤ ناڤـــــا بـــــێ ئیعتیبـــــارە
چنكـــــو ل دیرۆكـــــا وی دیـــــارە
ڕێبـــــازا وی هـــــەمـــــی هوموومـــــە

ئـەگـەر هـزار قـەلـەمـا تـو بینـی
كاغـــــەزا تـــــو پ نـــــەخشـــــینی
گونـەهێـت وی ب دویمـاهی نـائێنی
ژمـــــارا وان مـــــــەعدوومـــــــە

ســـەدام بـــۆ فیرعـــەونـــی عیراقـــێ
وی نـــــەهـــــێلا بچـــــەك تفـــــاقێ
وی و هـــەڤـــالا بـــەرێ خـــۆ دا نیفـــاقێ
نـــك كـــورد و عـــەرەبـــا مـــەعلوومـــە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

وەكـــی ئێـــك بـــو ڕەئیســـێ دەولـــەتێ

دێ دەت شــــەعبـــێ قیمــــەتـــێ

دا هــــەمـــی ببیــــنن لــــەزەتـــێ

كـــەســـەك نـــەبیـــت مـــەحروومـــە

# قیامەت[١]

قیامـــــەت ڕۆژەکـــا ب ترســـە
هـــەمـــی تێهنـــە و هـــەمـــی برســـە
کـــەس ل حـــالێ کـــەس نـــا پرســـە
هنـــــدی رۆژەك تــــــەنگاڤیــــــە

کـــەس هـــەوارا کـــەســـێ ناهێـــت
چنکـــــو کـــــەس چ ژێ ناهێـــــت
پتــــر ترســـــا ب ســـــەردا دهێـــت
چنکـــــــــو ڕۆژا دوماهیـــــــــە

بــــاب دێ ژ کـــــوری ڕەڤیـــــت
دای دێ ژ کچــــــێ ڕەڤیـــــــت
بــــرا دێ ژ بــــرای ڕەڤیـــــت
کـــەســـێ دل ب کـــەســـڤە نینـــە

هـــەر کـــــەس و کـــارێ کـــری
کـــەس دەســـتێ کـــەســـێ نـــاگری
ئـــــەو د ترســــــن ژ ئـــــاگری
ژ بـــەحـــەشـــتێ بـــێ هیڤینـــە

وەکـــــی ڕۆژ د هێتــــە هنــــداڤێ
ئـــەو دێ کـــەڤـــن خـــۆ هـــۆ ئـــاڤێ
ب دەســـت ناکـــەڤـــین فـــڕەك ئـــاڤێ
هـــەر کـــەســـێ هـــای ژ خـــۆ نینـــە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو و جهێ ڤەهاندنێیە.

ل حـــەشـــرێ وەك ســـەرخۆشـــا
ژ ترســـا وەك مـــەنـــدەهۆشـــا
ســـاخێ وەكـــی نـــەخۆشـــا
كـــەســـێ ئـــاخفتن نینـــە

ئـەڤـەیـە كـارێ گونـەهكـارا
دمیـــنن وەك دیـــن و هـــارا
ژ دەســـت وانـــا چـــو رۆژا پـــالا
ژ كارێـــت خـــۆ بـــێ هیڤینـــە

مـــە زۆركـــر بـــەحســـێ خرابـــا
ئـــەو دێ كـــەڤـــن عـــەلابـــا
دێ كـــوزرن وەك كـــەبابـــا
ژبـــەر كارێـــت خـــۆ دانینـــە

بـــەرێ خـــۆ بـــدە چـــاك و باشـــا
ئـــەون وەكـــی میـــر و پاشـــا
ئـــەو دێ چـــن بـــەر ســـها عـــەرشـــا
نـــە وان برســـە نـــە تێهنـــە

# پێشمەرگە مەغدۆرە[١]

پێشمەرگە مەغدۆرە
هەرۆ وانا پۆرە پۆرە
پارێت پارتی نێ زۆرە
بۆ پێشمەرگە ژی دوورە

مەسئول هەمی زەنگینن
قەسر و قوسیرا دا دروینن
چیا حەزکەن دێ ئینن
بەریکا وان یا کوورە

هەمی خودان سوپەرن
ل باسێ وان ئەفسەرن
دائیم حەرەس ل بەرن
ڕێکا نێزیک و دوورە

گەر ئەڤ پێشمەرگە نەبیت
ما دێ سەرکەفتن هەبیت
ما دێ وان سەیارە هەبیت
نەساخ موحتاج دوختوورە

ئەڤ پێشمەرگێ هو ڕوباد
ئەوان دوژمن ڤەبراند
بۆ وان نینە چ ئیمداد
ژ جەبهە دی ناچیت دوورە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو و جهێ ڤەهاندنێیە.

ڤـــی لـــەشـــکەری خودانکـــەن
وەکـــــی پـــەزی دوودانکـــەن
دا دوژمنـــــا فـــــەناکـــــەن
عـــەیـــالێ وان پـــور پـــوورە

هـــــەرۆ دێ وان هـــــەژمێـــرین
کـا ئـەو چـەنـدن چـەنـد مێـرن
مـــەســـئوول هـــەمـــی تێـــرن
ئـــەو بـــێ پـــێلاڤ و گـــوورە

وەکـــــی بـــاوەری نـــــەمـــا
دێ کـــەڤـــن دەرد و خـــەمـــا
هـــەرۆ هـــەژمێـــرن هـــەمـــا
مـــادەم دەڤتـــەر بـــێ مـــوورزە

## بلا مرۆڤ نەژیت بۆ ژینێ[(١)]

بلا مرۆڤ نەژیت بۆ ژینێ
بلا مرۆڤ بمریت بو ژینێ
ئایا چ دەرمانە ڤی برینێ
ئیخلاسە و ئێكگرتنە ل ڤێ حینێ

گەلەك شۆڕەش كوردا پێت كرین
گەلەك شەهدیێت بن ئاخكرین
ب صەدەها سالا زەحمەت برین
ل دوماهیێ پێت ساقط بووین پێت گرین

ئێك ژ وان شێخ مەحموودێ حەفید
یێ دوویێ پیرانێ شێخ سەعید
یێ سێیێ سمكو شكاكێ[(٢)] عەگید
یێ چارێ شێخ تەهایێ نەهری[(٣)] خۆ كر بەرید

---

[(١)] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[(٢)] سمكۆیێ شكاك سیاسەتڤانێ ناڤدارێ كورد، ل سالا (١٩١٩)ێ، دژی حكوومەتا ئیرانی دەست ب شۆڕەشێ كر، ب تروركرنا ئەوی ژ لایێ هێزێن ئیرانێڤە ل سالا (١٩٣٠)ێ، ب داوی هات.

[(٣)] یا دروست شێخ عوبەیدوڵلاهێ نەهری یە، ل سالا (١٨٨٠)ێ، سەرهلدان كر و ل داویێ ل سالا (١٨٨٣)ێ، هاتە تێكشاندن و دویركرن بۆ حیجازێ و هەر ل وێ سالێ ل وێرێ مالئاڤایی كر..

# حزبا بەعس هەرفی دگەل سەدامی[1]

حزبا بەعس هەرڤی دگەل سەدامی
ئازادیێ ڤەگرت عیراق ب عامی

ئازادی هات دکتاتوری چوو
ژ بەغدا بگرە هەتا بەکرەجوو

تاریاتی چوو وا هات ڕۆناهی
سەدام و بەعس ڕۆخیان ب ساناهی

د مودەهێ سهـ و پێنج سالا
تازی بوو ل عیراقێ ل هەمی مالا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## ئەڤە پێنجی و سێ ساڵە ئەز پارتی[1]

ئـــەڤــە پێنجـــی و ســـێ ســــاڵە ئـــەز پــــارتی
وەك چــــاڤێ خــــۆ مــــن یـــــا پاراســــــتی
وەك دایــــێ مـــــن یــــا ژێ کـــــر مــــاتی
نوکـــــە ئــــەزێ پیـــــر بــــوویم ل قورنـــــەتـــی

ل پێنجـــی و نـــەهـــێ ئـــەز بوومـــە عـــەســـکەر
مـــن گـــەلــــەك خـــارن کــول و کـــەســـەر
بـــۆ مـــن نـــــەمــــان چـــو هێــــز و مـــــەفـــەر
شـــۆڕەشــا ئیلـــونی ســـەرهلـــدا گـــەڕام وەلاتـــی

ل دوویـــێ هـــەیڤـــا دەهـــ شێســـت و ئێکـــێ
مـــە عـــەســکەری هـێلا ئـــەز کـــەتـم ڕێکـــێ
ل ئێڤاریـــــا درەنـــــگ گـــــەهشـــتم زاخـــۆکـێ
چـــووم نـــك نـــۆرەدینـــی[2] کـــادرێ پـــــارتی

ل ڕۆژا ســـێ هـــەیڤـــا دەهـــ چومـــە دەرگـــەلـــێ
بـــارزانی نـــەی حـــازربوو بـــۆ بێـــژم مـــەســــەلـــێ
نـــورەدینـــی ئـــەز بـــرم نـــك ئـــەحمـــەدی ل مـــەزەلـــێ
من گۆتێ ئەزێ هاتیم ببم پێشمەرگێ وەلاتـی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(٢) زانا و هەلبەستڤان مەلا نۆڕەدین مەلا حەسەن بێشیلکی سندی (١٩٣٢-٢٠٠٣).

گـــۆت تـــو بخێـــر هـــاتی ســـەرچاڤـــا
ئـــەزێ نـــاڤێ تـــە نڤیســـم ل نـــاڤ ناڤـــا
هـــەرە بێهنـــا خـــۆ ڤـــەکـــە ڤـــان گاڤـــا
دگـــــەل نـــــۆرەدینییـــــە ڤـــــی کـــــاتی

بـــارزانی وێ رۆژێ چـــوو بـــوو باڤییـــا[1]
چـــوو ببـــو کـــارەکـــی یـــێ ویـــت ڤییـــا
ئـــــەوێ خـــــائین بخـــــۆ رەڤییـــــا
بـــارزانی ئیقبـــال بـــوو بـــو کـــوردا هـــاتی

ئـــەوێ زڤـــڕی بـــارەگـــا بـــر گـــەرمکـــێ[2]
ل نـــاڤ بـــەرواریـــا نێـــزك چـــەلکـــێ[3]
شـــۆڕەش نـــوو ڤـــەکـــر گـــازیکر خـــەلکـــێ
ئـــەو بـــوون پێشـــمەرگـــەیـــێ ڤییـــای پـــارتی

مـــەلا نـــورەدینـــی تڤـــەنـــگ دا مـــن ئینگلیـــزی
مـــــن دا ملـــــێ خـــــۆ زۆر ب شـــــانازی
ل دەشـــــت و چیـــــا بـــــو قێـــــر و گـــــازی
شـــۆڕەشـــێ ســـەرهلـــدا دوژمـــن هـــەلاتـــی

---

[1] ڕاڤینیا، گوندەکە سەر ب دەڤەرا (سلێڤانەیان) ڤەیە.

[2] چەلکێ، گوندەکە سەر ب دەڤەرا (بەرواریان) ڤەیە.

[3] گەرمك، گوندەکە سەر ب دەڤەرا (بەرواریان) ڤەیە.

## ئەی موسلمان ڤێت خۆ بناسی[1]

ئـــەمـــی موســـلمان ڤێـــت خـــۆ بناســـی
کاچـــەوا چـــێ بـــووی ژ ئـــەساســـی
ڤێـت بـۆ خـودێ وە هـەبیـت ئیخلاسـی
نـەبـن هــەڤـال بـۆ ئــەلخــەنناســی[2]

هزریکـــە بـــەری نوکـــە تـــو نـــەبـــووی
بـــاش بزانـــە کـــا چـــەوا چێبـــووی
ژ ژن و مێـــرا کـــا تـــوچی بـــووی
ب ڤـــی تـــەرزی ڤێـــت خـــۆ بناســـی

ئـــەسـلێ تـــەیـــە ژ ئاڤـــا مـــەنـــی
تـــژی زکـــێ تـــەیـــە ریخـــا گـــەنـــی
تـــو هنـــدە خـــۆ مـــەزن دکـــەی دکـــەنـــی
خـــودێ خـــۆ ناســـبکە بکـــە ئیخلاســـی

تـو چپکـەك ئـاڤ بووی تـو بـووی مـرۆڤ
ڤێت ل دەڤ خـودێ خـۆ بکـی مـەعـرۆف
خـودێ ژ خـۆ ڕازیکـە خـۆ نـەکـە هـۆف
واجبـــە ل ســـەر تـــە خـــودێ بناســـی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] شەیتان.

تـو ل عـەدەمـێ بـووی تـو ئینـای وجـۆدێ
بـــۆ تاعـــەتـــێ وی بکـــە جهـــۆدێ[١]
ل بـەر ئـەمـرێ وە نـەکـەی ججـۆدێ
گوهـ نـەدەن شـەیتـان ئـەوی جاسوسـی

بـــلا ل بیـــرا وە بـــت خـــودێ و مـــرن
بـــلا کـــارێ وە بیـــت تاعـــەتکـــرن
هـەر کـەسـەکێ ڕۆژەکا هـەی دێ مـرن
ڤێـت ل سـاخیێ ل حـالێ خـۆ بپرسـی

(١) بزاڤێ.

## یا ئیلاهی ئەلعالەمین[1]

یـــا ئیلاهـــی ئـــەلعالـــەمـــین
تـو مـە حفـظ[2] بكـی بـۆ دینـی مـوبین
ئـــەم فـــەقیـــرین ئـــەمـــین مســـكین
تـــو ڕەحمـــا خـــۆ ب مـــە دابینـــی

ئـــەم موحتـــاجی ڕەحمـــا تـــەنـــە
تـــو دزانـــی مـــە گونـــەهـــ هـــەنـە
بـــەلـــێ ئـــەم عـــەبـــدێت تـــەنـــە
تـــو موحتـــاجێ كـــەســـێ نینـــی

تـــو خـــالقی ئـــەمـــین مـــەخلـــووق
ئیمانـــدارا ناكـــەی مـــەحـــرووق[3]
بـــۆ بـــەحشـــتێ ئـــەمـــین مـــەعشـــووق
ئـــەم حـــەس دكـــەیـــن بـــۆ مـــە بینـــی

هیڤیـــــــدارین تـــــــە ببیـــــــنن
ل بـــــەحـــــەشـــــتا تـــــە دا ڕوینـــــن
ب هـــــەر دوو چاڤـــــا تـــــە ببیـــــنن
جـــان و تـــازە مـــە ڤـــەژینـــی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] پاراستن.

[3] سۆتی.

# ئەڤ دنیا هندە مەزن[1]

ئـــــەڤ دنیـــــا هنـــــدە مـــــەزن
تـــــەژی تێـــــدا بـــــاغ و ڕەزن
موســـــولمانێ ب دویڤـــــرا د بـــــەزن
پشـــتا خـــۆ یـــا دای ئـــاخرەتـــێ

مـــادەم مـــرن ل بێـــی مـــەیـــە
خۆشـــیا دنـــێ بـــێ فایـــدەیـــە
یـــا بـــاش بـــۆ مـــە هـــەر تـــەوبـــەیـــە
دا نـــەكـــەڤـــین ڕەزالـــەتـــێ

دنیـــا بـــۆ مـــە هـــەمیـــا وارە
مـــرۆڤ تێـــدا بـــێ قـــەرارە
شـــەیتـــان بـــۆ مـــە پـــیس نـــەیـــارە
بـــەرێ مـــەدا غـــەفلـــەتـــێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## ئاخ بۆ چوونا گوندا[١]

ئـــاخ بـــو چوونـــا گونـــدا
ل بـــاژێرا وەكـــی گونـــدا
خۆشـــــی ل مــــه هنـــدا
هــــەچكـــو ل گرتیخـــانێ

ل گونـــدا هـــەوا بـــوو بژوینـــه
یـــا خۆشـــه تێـــدا ژینـــه
هـــەوجـــەی دەرمانـــا نینـــه
باشـــتره هـــەوایـــێ كوردســـتانێ

گـــەر گونـــد هاتبـــان ئاڤـــاكرن
رێـــــك هاتبـــــان چێكـــــرن[٢]

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] ب ڤی شێوەی ب دویماهیك هاتیە.

## بارێ من گرانه نه وەك ڕِساسی[1]

بــارێ مــن گرانــه نــه وەك ڕِساســی
مــن هیڤییــه پــێ ئاڤاکــەم ئــەساســی

بنســترێ دەیــنم ســەر پشــتا گاوماســی
دێ ئاڤــاهی ئاڤاکــــەم ب ئیخلاســـی

---

[1] ئەڤ هەلبەسته بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییه، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیه هەلبژارتن.

# کورد چ بکەن باشە[١]

کورد چ بکەن باشە
تایبەت ل ڤی کاتی
ئێکگرتن زۆرا باشە
ببن ئێک هەمی پارتی

کاتێ ئەم نهۆ تێدا
ئەز دبینم بڤەیە
تێکچوونا بەغدا یا د رێدا
عەرەبا نەڤێت دیموکراتی

رۆژ ب رۆژێ خرابترە
کەس قەدرێ کەس ناگرە
رۆژ ب رۆژ خرابترە
چنکو یا بی دوروییاتی

سوننە و شیعە نابن ئێک
چەند ئەو رۆنن دەڤ ئێک
مەزهەبا یا ل وان تاریکری رێک
یا دویرە ل وان برایەتی

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەک ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

کورد دڤێت خۆ هشیارکەن
یەك خال ل دویڤ وان بەرنەدەن
دستووری بگرن و بەرنەدەن
دا عیراق ببت دیموکراتی

هەمی پارتی ل دەڤ ئێك ڕوینن
دا ئێك و دوو تێبگەهینن
دا کەرکووکێ بدەستخۆڤە بینن
دا شەرم بکەن تکریتی[1]

---

[1] مەبەست سەدام حسێن تکریتی.

## بارزانی تو شەهیدەك نەمری[١]

بارزانی تو شەهیدەك نەمری
تو خودان پێشمەرگەك خۆڕاگری
مزگین بۆ تە کوردا دای ئالایێ بلندکری
ب شێوەك جوان کوردستان ئاڤاکری

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

# حەفسەد سالا بەری عیسا پێغەمبەر (س)[١]

حـــەفســـەد[٢] ســـالا بـــەری عیســـا پێغـــەمبـــەر
ڕابـــوو ســـەرخـــۆ کـــاوەیـــێ ئاســـنگەر
زوڵمـــا ضـــەحـــاکی ل نـــاڤ ئاریـــا کـــرە دەر
ل نـــاڤ ئاریـــا بـــۆ شـــەهیانـــە و ئـــازادی

ضـــەحـــاك عیراقـــی بـــوو خـــەلکـــێ بابـــل
عفریتـــا بـــر ئیرانـــێ ل ســـەر مـــل
قـــەلعـــەك ئاڤـــاکر موکـــوم و کامـــل
وی ل مللـــەتـــێ ئـــاری کـــر زۆر بێـــدادی[٣]

ضـــەحـــاکێ ئـــەژدەهـــا کـــەفـــت و نـــەســـاخ
زوڵمـــەکـــا زێـــدە ویـــدکر ســـەر د ئـــاخ و ئـــاخ
ل نـــاڤ ئاریـــا کـــەســـێ نـــەمـــا زاخ
کاوەیێ کوردا بۆ سەر بۆ خۆ نەکر نەمەردی

کـــاوەی ئـــەو زاڵـــم ب چـــەکـــوچی کوشـــت
ژبـــۆ خـــاترا مللـــەتـــی خوینـــا وی ڕشـــت
ئـــەو غـــەدر ڕادا چـــو ژێ نـــەهشـــت[٤]
بـــۆ ئاریـــا هـــەلات باشـــتر ڕۆژەکـــا دی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(٢) حەفت سەد.

(٣) زوڵم.

(٤) نەهێلا.

ضەحاك نەساخبوو ئێش كەت گیانی

چوو دوختورا دەرمانێ وی نەزانی

حەكیمەك بۆ چوو ژ خەلكێ تركانی

ئەڤی خەبەر بۆ من گۆت كوڕێ نالبەندی

# بانگەشەیە بانگەشە[1]

بانگـــــەشـــــەیـــــە بانگـــــەشـــــە
گـــــولا پـــــارتی[2] هـــــەر گـــــەشـــــە

بـــــەلـــــێ دلـــــێ هنـــــدەكـــــا ڕەشـــــە
نـەشـێن گـەل پـارتی بكـەن گـەنگـەشـە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] پارتی دیموكراتی كوردستان ـ عیراق.

# ئەز چ بێژم چ بەیانکەم[1]

ئەز چ بێژم چ بەیانکەم
نەهێنییا ئاشکەراکەم
دیرۆکا کوردا ئەز عەیانکەم
دا خەلك ب حالێ مە بزانی

حەفت سەد سالا بەری عیسای
زمانێ کوردی یێ نڤیسای
هەتا نوکە زمانێ مای
دوژمنا یا ل وانکری بێ وژدانی

سەد و پێنجی سالا حوکمێ کری
پاشی تێکچوو لێ بوو گری
هەتا نوکە مانە مری
حەرام بوون ژ مافێ ئیسانی

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## گورگ و پلنگ و شێر[١]

گـــــورگ و پلنـــــگ و شـــێر
ئـــەڤـــە هـــەر ســـێ خـــائینن
ل نـــــك وان نینــــە چـــو خێـــــر
نـــەك و كـــەس بـــاوەریـــێ پـــێ بیـــنن

حـــــەســـــودیا وان زێـــــــدە دژوارە
نابیـــــت خۆشـــتقی هـــەر نـــەیـــارە
ب شـــــــەڤ و رۆژا غـــــــــەددارە
لازمـــــــە وان ڤـــــــەبریســـــــنن

چێنابیـــــت دگـــــەل وان بســـــتەهـــی
دێ تـــە خـــون ئـــەڤـــرۆ یـــان ســوبەهـــی
چـــەنـــد تـــو وان بكـــی كـــەهـــی
گاڤا بۆ وان هـەلكـەت دێ تـە درینن

ئـــەڤ چـــەنـــدە میســـال بـــوون
مـــن ببـــوو وە گـــۆتن هوســـا
دا هـــوین نـــەبـــن پـــەشـــێمان و مـــوون
ما وە گولێ نەبوویە چیرۆكا كوسا

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## ئەمێت چووین سەر پێسترکێ[1]

ئـەمێـت چـووین سـەر پێسـترکێ
هــا نێزیکــە ســەرکــەڤــین
ڤێــت خـــەبــاتێ باشــترکێ
خــۆ ڕاگــرین نــەکــەڤــین

بـەرێ مـە هـەرێ قـەسـر و سـەیـارا
مـەیـا ژ بیرکـری مرمـرِا تـەیـارا
بـــەرێ مــــە یـــێ ل دولارا
ئـــەز دبیـــــنم دێ ڕەڤـــــین

بـــەرێ خـــۆ بـــدەن تروریســـتا
شـــــەڤ و ڕۆژا گورمێنـــــــە
وا دڤێـــت مــــە بـــێخن ڕســـتا
ئـــەم نـــە هشـــیارین د خـــەویـــن

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

# کوردستان خۆشەویستە[1]

کوردستان خۆشەویستە    پاراستنا وێ یا پێویستە
کوردستان ئێکە نەچار قستە    هێز یا ل بندەستا ڤەڕستە

دوو هزار وحەفسەد[2] و دوازدە سالە    هەمی کوردان نالە نالە
بۆ من بێژن ما ئەڤ حالە    هوسا قەدەم ل وە شکەستە

هەچیێ ڕابوو قارتەك چێکر    ب نەزانین ناڤەك لێکر
دل نەخۆشی بەلاڤکر    خارکر ڕێکا درستە

ئەی گەلی کوردا باشێ ناسبکەن    دا هین بگەهن مرادا خۆ
بەس خۆ خاڤ و سست بکەن    پارتا بارزانی خورستە

ئەڤە شێست و چار سالە    ئەوا دکەت خەباتێ
چبکو ڕێباز دەلالە    ڕاکر ئالا مەهاباتێ[3]

پارتا بارزانی پارتە    وێ کورد کرن فیدراڵی
ئەڤ پارتێت دی هەما کاتە    یا پەیداکری مژویلی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] حەفت سەد.

[3] مهاباد.

## ڕۆژا جەژنا حەجیا[١]

ڕۆژا جەژنا حەجیا
ئێکی هەیڤا سوباتێ
تیرۆرا ئیسلامیا
شەهیدکرن پێشمەرگێت پارتێ

ئیسلام ژ وان یا دویرە
ژ عەردی هەتا ئەسمانی
حسابا وان یا هویرە
ئەو نا چنە بەحشتێ

تیرۆر مە گیرو ناکەت
ژ ڕێبازا بارزانی
گاڤا بۆ مە هات فرسەت
دێ ئەوان ئێخین خەتێ

شەهیدیت مە بەحشتینە
شەهیدیت ڕێکا خەباتێ
تیرور تێنە گەهشتینە
کاچەوانە زەڕپێ پارتێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

پارتی دێ وان حەلینیت

دێ ل جەهنەمێ وان کەلینیت

هەرگاڤا دێ وان شەلینیت

ئەو نابینن نەجاتێ

# بلا بەس بیت گەلی کوردا ژێك بەلاڤی[1]

بلا بەس بیت گەلی کوردا ژێك بەلاڤی
هەتا کەنگی ژ وەلاتێ خۆ ببین هاڤی
دیارە وە پێخۆشە ب ڤی ناڤی
هەر بمینن ل ناڤ حەپس و زیندانا

ئەرێ ما خودێ پاتکا مە دایە بۆ شەقا
ب سەدا سالە ویڕ ویڕا مەیە وەك بەقا
دێ هوسا ژ خۆ ڤەکەین نەهەقا
هەمیا خۆ فیدا کر کوردێت زانا

کانێ قازی کانێ سەعید پیرانی
کا شێخ مەحموود کا مستەفا بارزانی
کا تاها نەهری[2] کا بەدرخانی
هەمیا خۆ کر گوری وەکی قوربانا

بلا کورد بزانن ئەوێن ئەو بێ خودانن
ڤێت خۆ بکەن ئێك نیزامێ[3] دانن
ترك فارس و عەرەب دوژمنێت وانن
ئەو هۆ بووین ڕەبەن ل ڤان زەمانا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] مەبەست (شێخ عوبەیدوللاهێ نەهری).

[3] حکومەتێ.

کورد ل ڤێ دنێ وەکی قەرەچا
بەلاڤن ل دنێ وەك گور و هرچا
ل بەر خەلکێ ڕادگرن هەر دوو چەچا
کەس نادەت وان دوو کەرێت نانا

ئەو ژینا هوسا کەربریت سەر
بل هۆ بژیت کوردێ خولیسەر
بۆ وان مایە چورێك و مەفەر
بلا هەر هۆ بمینن ل دەر و کولانا

بەسە خۆ بکەن ئێك هەر وەکی برا
ببن ڕۆناهی هەر وەکی چرا
وەنەکەن جارەك دی نان ببیت درا
نەدەن دوژمنا ڤان کوردستانا

هەچێ رابوو پارتەك ئاڤاکر
دوو میتر پاتە هنداڤ خۆ ڕاکر
ئەو نزان کو وان مللەت خرابکر
وان مللەت پتر ئێخست قەیرانا

ئەڤ سیاسەتا هۆ بەروڤاژی
ئەی کوردێ دەلال هوسا تو ناژی
کویسەلە برە ڤێ ناگەهیت تاژی
بەس ب کوردا بکەن لەعب و ترانا

مە کوردا یا هەی پیچەك فیدرالی
یا ژ مەڤە ئەمێت بووینە والی
وێهە نۆری ئەلمالکی شبهی دەجالی
(یقول مدینە کرکوك هي مالتنا)[١]

گەلی کوردا گەلەك شەرمە

---

[١] دبێژیت باژێڕێ کەرکووك یا مەیە.

ئـــەڤ هنـــــدە زۆرداری مایـــــە ل ســـــەرمـــــە
چـــی ئاســـــتەنگــــن كـــــەتـــین بـــــەرمـــە
خـــــۆ بكـــــــەن گـــــوری كوردســــــتانا
شــــــەرمــــێ بكـــــەن ژ لـــــەیــــلا زانـــــا[١]
هــــــەرا ل نــــــاڤ حــــــەپــــس و زینــــــدانا
ســــــەرێ خـــــۆ ل بــــــەر دوژمنـــــا نـــــەدانـــا
خـــــــەباتكــــــــەرە بــــــــۆ ئینســــــــانا
كوێـــــــت محـــــــافزەك[٢] بـــــوو عێراقـــــی
چنكـــــــو هـــــــەبــــــوو تفـــــاقی
نوكــــــــە دەولـــــــەتــــــە یـــــــا ڕاقـــــی
ئـــــەم كـــورد هــــەر یێـــل بـــەر ئـــێش و ژانـــا
بـــــــــاش بـــــــــدەن گـــــــــوهی
ئـــەرێ د نـــاڤ مـــــە دان نــــەبـــوون جـــوهی
وان كــــارێ خـــــۆت[٣] كــــــر ب كـــــوهی
هــــــەر بــــــەرێ خـــــۆ بــــــەدە تـــــەیارخانـــــا[٤]
گولـدەمـەئیـر[٥] هـەڤـدە سـالا بـۆ وەزیـرا خـارجی
كــــەســــەك نــــەشــیا بــــۆ چێكــــەت ســـویجی
چنكـــــو وێنـــــە كــــرن چــــو پـــــویجی
یــێ ژ جوهیــا ت[٦] ترســن دەولــەتێــت موســلمانا

---

[١] لەیلا زانا، سیاسەتڤان و چالاكڤانا كوردا باكوور.

[٢] پارێزگەهـ.

[٣] د.

[٤] فرۆكەخانە.

[٥] گولدا میر (١٨٩٨-١٩٧٨) سیاسەتڤانا جوهی.

[٦] د.

# چێکەرێ عەرد و عەسمانا[١]

چێکەرێ عەرد و عەسمانا
ئەوە خودایێ هەمە
خۆ هشیارکەن گەلی موسلمانا
خو نەئێخن دەرد و خەمە

چو خودا نینن هەر ئەوە
چێکەرێ وە هەر ئەوە
چو خودێ دی نینن درەوە
ئەوە یێ ڕزقی د دەت هەمە

ئەڤ جیهانا هندە بەرین
وی یا ئینای وجودێ[٢]
هەر بۆ وینە مەزناتی و ئافەرین
هوین بخوینن جوزیا عەمە

یا تێدا هاتی (قل هو الله احد)[٣]
هەر ئەوە و هەتا ئەبەد
نابیت هەڤالەك هەبیت قەد
ئەوە نازلێ تەورات و ئنجیل و قورئانا هەمە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] هەبوونێ.

[٣] بێژە خودایێ مەزن ئێکە.

يێت تێدا بەيانكرين ئەمر و نەهی
باش خۆ هشياركەن ما تو تێناگەهی
نێ وی تو يێ چێكری ژ ئاڤا مەهی
ڤێت تو شوكردارێ وی بی هەمی دەما

دڤێت باش ئەم ژێ بترسين
چاك بەرێ خۆ بدە سۆرەتا ياسين
كا چ تێدا هاتيە نڤێسين
هەمی تشت تێدا بەيانە چو حەجەت نەما

تو دێ مری چیە قەبری
ڤێ نسحەتێ بخو بگری
باش بترسە ژ ئاگری
وە هۆ بەر ل دينی نەما

من ل هەوە كر ئەو نسحەتە
گوهێ خو بدێ خۆش نعمەتە
ئەڤەرێكا سەعادەتە
دا تو نەچی ناڤ جەهنەما

## من دڤێت ئەز هۆزانەکێ ب بارزانی بێژم[1]

من دڤێت ئەز هۆزانەکێ ب بارزانی بێژم
بەس ئەز نەشێم هۆزانا تازە دارێژم
چنکو ئەزی کەڕ و گێژم
کو ئەوسافێت[2] بارزانی ب تمامی بێژم

چنکو یا وی کری کەس نەکری یە
ئاگرێ شۆڕەشێت وی هەلە نە تەمری یە
دیروکا کوردا نەو نەمری یە
پارێزگەهێ کوردانە ئەز دبێژم

پینجی سالا شۆڕەش کرن نە ڕەڤی
سەرێ خۆ بۆ چوو دژمنا نەکر نەڤی
نوکە کوڕ سەرۆک پارتە و سەرۆك وەزیرە نەڤی
ڕازق خودێیە ئەزێ ب خەباتا وی دژیم

بارزانی سونبلە بۆ هەمی کوردا
ناڤودەنگێ وی یێ بەلاڤبووی ل هەمی ئەردا
دوژمنا ژبەر خەباتا وی کەتن دەردا
یێت وەکی سەدامی و عەلی کێمیاوی[3] گۆت.........[1]

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) سالوخەت.

(3) عەلی حەسەن ئەلمەجید، د ناڤ کورداندا ب (عەلی کیمیاوی).

بـــــارزانی تـــــو ســــــەرکـــــردەك جیهـــــانی
وەســفێت تــە نــەشــێت بێژیــت کــورێ تــەتــەرخــانی[2]
هیڤیـــــدارم ژ خــــودێ تـــــە گــــورٍ ببــــت نـــــوورانی
چـــو ژ مـــن ناهێـــت ژ غـــەیـــری بـــۆ تـــە دوعـــا بێــــژم

---

[1] نەهاتیە خواندن.

[2] تەتەرخان بابی مەلا عەلی، هەلبەستڤانێ ڤێ دیوانێ.

# من هیڤی ژ کوردا هەیە[1]

من هیڤی ژ کوردا هەیە
بیرنەکە باب و باپیرا
نێ مە ژی کەلتورەك هەیە
مخابن بچیت ژ بیرا

ئەو ژی فلکلۆرە
هندی بێژی یێ زۆرە
ئیرۆ ئەمێت ماین کۆرە
کورد ناکەن تەڤن و بیرا

کانێ شەل کا شەپك
کا گولول و کا ڤڕك
کا گورە و کا چوخك
ئەو بوون جلکێت وەزیرا

ڤی لباسی و تەرزێت بیانی
بەهرا پتر حەرامن بۆ ئینسانی
جەحێلێ نوکە نەزانی
هێلا ڕەوشتێ پاشا و میرا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

# خویشك و برایێت موسلمان[١]

خویشك و برایێت موسلمان
بخۆ بگرن دین و ئیمان

دنیا هەر مرن و هێلانە
بێ فایدەنە داوات و دیلانە

خویشك و برا خۆ هشیارکەن
مافێ خودێ سەر خۆ ڕاکەن

قەبر تەنگە چار دیوارن
وان گونەهکار هەمی خارن

بەرێ وە کەت لەعب و لیتا
ما هوین نابینن ڤان ڕویس و ڕویتا

بزڤرن ژ خودێ بکەن شەرمێ
وەکی ڕوح چو ل ناڤ چەرمێ

دێ مەنجەلا دانن کوچکا
دێ بەردەن لەوندی و هوچکا

یا باش ئەوە تاعەتکرن
یا نێزیکە بێژن برن

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

خـــودێ ئـــەم دايـــن بـــۆ تاعـــەتـــى
كـــەس نامينـنـــت ل ســـەر تـــەختـــى

بخـــۆ بكـــەن زكـــر و تاعـــەتـــا
خـــۆ زيـــرەككـــەن وەكـــى پـــەيتـــا

## بەرێ خۆ بدەنە ڤەگەڕھانێ[1]

بەرێ خۆ بدەنە ڤەگەڕھانێ
بگرن ڕۆژێت ڕەمەزانێ
حیلەکەرە وەك دێ ھلانە
دێ پێشەمانبن ل بەر مرنێ
خۆ بۆ مرنێ ب کاروبارکەن
دا سەر بەست بچی قەبرستانێ
تەژی تێدا مشك و مارن
نەمان چاکی بۆ دومانێ
نە گوھدە بێ دین و فەلیتا
ما وە باوەرە ھوین ناھێن عەزابدانێ
تو خۆ ناگری ل بەر گەرمێ
دێ بی کەلەخ ل دیوانێ
بەرێ خۆ بدەن کوڕ و کچکا
دێ کەن گری برا کانێ
یا بێ شکە یا ھەی مرن
ل ناڤ گوڕێ پێشەمانێ

---

(١) ئەڤ ھەلبەستە بێ مێژوو، جھێ ڤەھاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان ھاتیە ھەلبژارتن.

ل ڤــــێ دنيــــا وەكـــــى وەختـــــى

هــــەمـــــى دێ چـــن بــــۆ نــــەمـــانێ

ل مـــــــال و ل مزگــــــــەفتــــــا

بــــــۆ ڕۆژا حــــــەشــــــر و ميزانـــــــێ

## ئەگەر تە دڤێت باش بژی[(١)]

ئـــەگـــەر تـــە دڤێـــت بـــاش بـــژی
بــــــەرێ خــــــۆ بــــــدە پـــــاقژی
پیســــــــــە مـــــــــالا قرێـــــــــژی
زێـــــدە نــــابن عــــەمـــــر و ژی

پــــاقژی پشـــــکەکـــــە ژ ئــــاایینی
ڤێـــــت ئـــــەم هـــــەمـــی چاڤـــدینێ
گــــــەر وەنـــــەکـــــەی خـــــائینی
کومبکــــــە عــــــەقـــــل و مـــــەژی

پــــاقژی ســــحەتــــە بــــۆ بــــەدەنــــی
نـــــەخۆشـــــە بێهنـــــا گـــــەنـــــی
ڤــــێ بزانــــــە ئـــــەزبـــــەنــــــی
گــەر وەنــەکــەی دێ خــۆ کــوژی

خــــــودێ ژ مــــــە دڤێــــــت پــــــاقژی
نــــــەڤێــــــت مرۆڤــــــێ قرێـــــــژی
باشـــــترین کــــــاره دەســــــتنڤێژی
دێـــل بـــەحشـــتێ هـــەل پـــەقـــژی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

مرۆڤـــــــى پـــــــاقژ و بـــــــوژين
ئـــــەو كـــــەس دێ تـــــازە ژيـــــن
چ هـــــەفســـــەر بيـــــت چ هـــــەڤـــژين
دێ خۆشـــــــبيت مـــــــالا بـــــــوژى

## هەمی كەس ئەڤیندارن[(١)]

هـــەمـــی كـــەس ئـــەڤینـــدارن   بـەلـێ هـەر ئێـك ب ڕەنگـەكـی
هــــــەمـــــی دل وەك بهـــــارن   خــۆ د كێشــیت دەنگــەكــی
خۆشــە دەنگــێ تــەیــڕ و تــەوالا   وەكــی د خــوینن ل دول و نهــالا
ل بهارێـــــت هـــــەمـــــی ســــالا   مــرۆڤ گوهــ دەت وی دەنگــی

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

# ماشائەڵلا بۆ جەحێلێ[1]

ماشـــائەڵـــلا بـــۆ جـــەحێلـــێ
کـــەزی بســـکێت وەکـــی تێلـــێ
نـــەدەرکـــەڤـــە کـــەس نـــەهێلـــێ
دا خـــەلـــك بشـــێت بچیتـــە مـــال

تـــود دەرکـــەڤـــی بڤـــی کـــوزۆتی
پیـــر و جـــەحێـــل بـــۆ تـــە سۆتی
تـــــە ئـــــاگر بـــــەردا مـــــازۆتی
خـەلکـێ هـێلان مـال و عـەیـال

مـا هـەمـا خـودێ تـو حـانکری
مـا دێ بـەردی خـەلکـی ئـاگری
خۆزیـــا وی یـــا تـــو مـــار کـــری
دا تـــو نـــە دەرکـــەڤـــی ژ مـــال

وەکـی دەردکـەڤـی سـەردەرەجـا
تـو تینـی سـەد زیـن و خـەجـا
دێ بییـە ئێشـا شـێر پـەنجـا
تـۆلاز هـەمـی دێ بنـە کـال

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## یا هاتیە گۆتن[1]

یـــــــا هاتیـــــــــە گـــــۆتن

چـــــودار نینـــــــە بـــــــای لێنـــــــەدای

دووبـــــــارە یــــــــا هـــــــاتی گـــــۆتن

چـــــو نـــــزار نـــــین تـــــاڤێ لێنـــــەدای

کـــــــورد هـــــــــاتن ســـــــــۆتن

بـــــــۆچی هنـــــــــدە پاشـــــــــڤەمـــــــای

وەرن دا بچـــــــین نــــــــك خــــــــانی[2]

ئـــــــەوی ئـــــــەڤ دەردە یـــــــێ زانـــــــی

نالبـــــەنـــــدی[3] و جـــــەگـــــەرخـــــوینی[4]

وان ژی ئــــــــەڤــــــــە یـــــــا زانـــــــی

خــــــۆ تــــــو بچــــــی نــــــك ســــــولتانی

وەك ڤـــــــان هـــــــەر ســـــــێیا نزانـــــــی

خـــــانی گـــــۆت ســـــەبـــــەبـــــە گـــــەنـــــدلی

جـــەگـــەرخـــوینی گـــۆت تـــەشـــبیها دیکلـــی

نالبـــــەنـــــدی گـــــۆت ژ بـــــێ عـــــاقلی

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٧).

(3) ئەحمەدێ نالبەند (١٨٩٠-١٩٦٣).

(4) جەگەرخوین (١٩٠٣-١٩٨٤).

کـــــاتبی گـــــۆت ژبـــــەر مـــــالی

خانـــدەڤـــانی گـــۆت کـــەت ڤـــی دلـــی

گوهـــدارا گـــۆت ئـــای بـــۆ ڤـــی عـــاقلی

# مخابن بۆ موسولمانا[1]

مخـــابن بـــۆ موســــولمانا
خودانێـــــت ديـــن و ئيمانـــــا
ئـــەوان گوهدايـــە شـــەيتانـــا
كـــچ و كـــوڕ ل كولانـــا

ژن ســەركـول و چــەچــك ڕويســى
ســەردا بــرن شــەيتــانێ ئبلــيس
ل نـــك وان ئـــەڤـــەيـــە نــاميس
ژن و ژەلام ل چايخانــــــــــــا

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونيشانييە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونيشان هاتيە هەلبژارتن.

# چەند دار هەنە ل کوردستانێ[١]

چەند دار هەنە ل کوردستانێ
پێب خوینا شەهیدا هاتین ئاڤدانێ
هەتا نوکە ئەمێ ل هیڤیا نەمانێ
ئایا ئەگەر چییە، چییە دەرمان

ئەگەر ئەوە ژێک بەلاڤین
لەوا ل ڤێ دنیایێ بێ ناڤین
ل سەر ئێک و دوو بێ سلاڤین
ب سەدان شەهید بوون قارەمان

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## نێ مرن ناهێلیت[1]

نێ مرن ناهێلیت
کەس بگەهیت مرادێ
دێ مە هەمیا ڕامالیت
دێ مە بەن بۆ لەحدێ[2]

باشترین کار ئەوە
مرۆڤ پێ سەرکەڤیت
ما نا دنێ درەوە
گەر تو برە ڤی بۆ هندێ

بۆ دینێ خۆ بکەن خەباتێ
ئەوە کارێ مرۆڤا
هوین بکەن زکر و صەلاتێ
ئەڤی کاری بەرنەدێ

دنیا هەردێ خرابیت
مرن ئەمرەك موتلەقە[3]
چی مرۆڤێ فەهما بیت
دێ گریت ڕێکا خودێ

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) گوڕ، قەبر.

(3) دێ هەر هێت.

ڕێکا خودێ بەرنەدەن
دا بکەهن سەعادەتێ
خۆ ب دنێڤە پیر نەکەن
باش دینێ خۆ گوهـ بدێ

دنیا گەلەك لەعابە
ئەو مرۆڤا سەردا دبەت
مرۆڤ تازە ژێ ڕابە
خۆش ژ دینێ خۆ نە لادێ

وی قەبرێ تەنگ و تاری
قەت ژبیرا خۆ نەبەت
دێ کەڤن زکێ ماری
نەشێ خۆ ژێ لادێ

خۆ هشیارکە لە ئەی برا
توچێکەی ڕێك و پرا
ژبەر دووپشکێت وەك حشترا
نەشێ بێژی وەی دادێ

دێ هێت شوجاع و ئەقرەع[١]
تە دل دی بیت ڕەع ڕەع[٢]
خۆزکە خودان تەمەع
تو دێ گەهێ ئیندادێ

---

[١] زیرەك.

[٢] ئارام.

ئـــەڤـــە باشـــترین قـــەلـــەمـــە

دێ نڤیســـــم هنـــــدی هــــەمــــە

پێنووســـــەك بـــێ ئـــەلـــەمـــە

وی نافرۆشـــــــم چــــــو دەمــــــا

## گوهێ خۆ بده من خودانێ شەلی[١]

گوهێ خو بدەن خودانێ شەلی
ناڤێ وی مەلا عەلی[٢]
دێ کەن بەحسێ گەندەلی
مرۆڤی د ئینیت رێزا دەکۆلی

گەندەلی کارەك حەرامە
قەبوول ناکەت ئیسلامە
دڤێت پێبکەن مەحکەمە
دا ئاشکەرا بیت و بەبەلی

کەسێ خۆ کر دزیکەر
وی نابن حال و مەفەر[٣]
هەتا وی مالی نەئینت دەر
دەست دێ هێت برین ئەوەلی

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] مەلا عەلی، هەلبەستڤان ڤێ دیوانێ.

[٣] رێك.

## بەرێ خۆ بدەن سەدامێ گونەهبار[1]

بــەرێ خــۆ بــدەن ســەدامــێ گونـەهبــار
وی ل بـــەحشـــتێ نینـــە چـــو بـــار
وی کوردێــت کوشــتین ب ســەدا هــزار
جهـــێ وییـــە جـــەهنـــەم و نـــار

وی نـــەهـــێلان چـــو عـــورف و عـــادەت
یـــا وی کـــری نـــاکن چ دەولـــەت
زولـــم و تـــەعـــدا بـــۆ وی عـــادەت
ســـــۆتن مـــــرۆڤ و دار و بـــــار

وی ژ فیرعـــــەونـــــی بوورانـــــد
مللـــەتـــێ عیراقـــێ ڤـــەبرانـــد
دێـــرو مزگـــەفـــت وی هـــەرفانـــد
ل عیراقـــێ نـــەهـــێلا چـــو ئیســـتقرار[2]

نوکـــــە قورئانـــــا هـــــەلگرتـــــی
ســـــتەمکـــــارێ تکریتـــــی[3]
یـــێ بـــێ نڤێـــژە نـــەعلـــەتـــی
بـــــۆ وی نـــــەمـــــان ئیعتیبـــــار

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] ئارامی.

[3] سەدام حسێن.

بۆ عیراقێ نەهێلان چو عەیش و حال
بۆ وی نەمان چو دوست و هەڤال
وی نەخاریە نانێ حەلال
خودانێ عەگالا ڕەش و خار

عەزازیلی حەفتێ هزار سال
تاعەتکر باشی وی تەکەبور[1] کر
ئەو تاعەت هەمی ژ بن بر
جهێ وی بۆ ئاگر و نار

گونەهێت سەدامی ژ گارەی گرانترن
ژ بەلگێت دارا پترن
ژ خیزێ چەما زۆرترن
بلا بین کاتت سەد هەزار

نوکە یێ بی فلم کارتوون
یێ ویت بینیت هەمی گەردوون
کاوەی چەند ڕشتییە خوون
(بلسانه الخبیپ الغدار)

انه الآن حامل القران
لیس له عقیده والایمان
صار ذئب للأنسان والحیوان
صار فقیرا و مفلسا

امتلا تاریخه بالاجرام
لیس له بیت ولا حمام
لیس له القیمه والأحترام
لا من الشمال لا من الاهوار

---

[1] مەزناهی.

صـــــــدام رئـــــيس المجـــــرمين
ضــــــد آيــــــات رب العـــــالمين
لا خيــــــر فيـــــــه للأخــــــرين
سـجل امــا فــى قائمــة الاشــرار


Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکولینێن کوردی

# ئەی کوردێ کوردستان[١]

ئەی کوردێ کوردستانی
هوین بیر نەکەن بارزانی
وی ئاساسێ بۆ مە دانی
ئەم بووین خودانێت پەڕلەمانی

وی یا دانای بۆ مە ڕێباز
هەمی بۆ وی ببن سەرباز
ل ئاستەنگا کرین دەرباز
داینە ناسین کوردستانی

کورد مریبوون وی کرن ساخ
سەد مخابن سەد ئاخ و ئاخ
خوزی بۆ مە ئەو مابا ساخ
دا بیتە زەعیمەك[٢] جیهانی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(٢) ڕێبەر، پێشەوا.

## بلا بەس بیت ژێك بەلاڤی[1]

بــلا بــەس بیــت ژێــك بــەلاڤــی
گــەلــی کوردێــت وەك دیکــلا
هــەتــا کــەنگــی ئــەڤ بــێ نــاڤی
نـــێ وەکــــو ل ئێخســـــتن دلا

نــە تــرك نــە عـــەرەب نــە فــارس
نـــابن هـــــەڤالێـــت کـــوردا
هـــــەر و هــــــەر ئــــەون منـــافس
چـــو جـــارا پێخــۆش نــەکــەن دلا

ڤێجــــا یـــــا فـــەر ئـــــەڤـــەیــــە
هــــەمــــی خـــۆ بکـــەنــــە ئێــــك
چـــــارەســــــەری ئــــــەڤــــــەیـــــە
هـــوین یێــت بیــنن هــەر چــار[2] مــلا

هــــەرو ئـــــەنفالـــــە ل ســــەر مــــە
مـــــا هـــــوین بچاڤـــــا نــــابینن
وان نـــــەیـــــارا ل گـــــەلمــــــە
گوهـــــــ بـــــــدەنـــــــە عـــــــاقلا

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) ل جهەکێ دیتر: سێ.

پا کەنگی دێ ب عاقل کەڤن
شەرمە طەعن بمە کەڤن
شەڤ و ڕۆژا نەنڤن
ڤەشدینن باسك و مەلا

هەچی ڕابوو پارتەك چێکر
ناڤەك ب دلێ خۆ لێکر
هەر ئێك بۆ یێ دی بۆ ڕێگر[1]
بۆ ئێك و دوو بوون بەلا

ب مەلیونا کورد دەربەردەرن
بێ عاقل و ئەپتەرن[2]
بێ رەئیس و ڕێبەرن
هەتا گوهـ نادەن مەلا

هەرە ل کوێت مێزکە
نێ ئەو ژی محافزەکە[3]
خەما هش بە دەینەکە[4]
شەرمێ بکەن ژ عەگالا

سەربەخۆیی ب زەحمەتە
تە دۆرمان دۆر حوکمەتە
ڤێت هەبیت خیرەتە
تێبگەهینی هەڤالا

(1) ل جهەکێ دیتر: ناڤەك ب دلێ خۆ لێکر.

(2) (ئەبتەر) واتە (نە تەمام).

(3) پارێزگەهـ.

(4) ل جهەکێ دیتر: هەما هشبە خیرەتە.

دەستا بکەن ناڤ دەست
دێ بینی دوژمن شکەست
فیل ژ سنگی ڤەڕەست[1]
سەد عنفەری باری کەللا[2]

ڕەئیسێ[3] وە هەی کەسێ نینە
بەلێ گوهێ وە لێ نینە
ژبەر هندێ گیرۆ بینە
هەتا هوین چوون جهێ شەکالا[4]

مەسعوود بۆ کوردا ڕەئیسە
بۆ زانینێ شیرێ ڕویسە
زۆری خودان نامویسە
یێ مەشهوورە ل دنێ وەك بابێ مەلا[5]

کوردە ڕێبەرە و زانا
ڕێبازا وان بۆ کوردا دانا
سەربلندە ل هەمی دیوانا
ئاخفتن خۆشە وەك بلبلا

ئەگەر هوین جامێرن
دێ مەسعوودی هەلبژێرن
پێشمەرگە ئەو هوین مێرن
گوهە نەدەن بێ ئاقلا

---

(١) ل جهەکێ دیتر: گرتی ل حەبسێ ڤەڕەست.

(٢) ل جهەکێ دیتر: هەر بژیت خودانێ شەلا.

(٣) سەرۆك مەسعوود بارزانی.

(٤) ل جهەکێ دیتر: خەلکی ئەم داین بەر پالا.

(٥) ل جهەکێ دیتر: مەشهوورە وەك بابێ مەلا.

وی هـــەلبژێـــرن کـــەس دینـــە
چنکـــــو باشـــــتر وی نینـــــە
ئـــەو بـــۆ کـــوردا پێشـــینە
گـــوهێ خـــۆ نـــەدەن چـــو قـــەلا[1]

یـــێ گوهـــ نـــەدەت ڕوبـــادی
ئـــــەو دێ چیتـــــە ڕومـــــادی
دێ هێـــت بیـــرێ ئـــەڤـــا دی
هـــــوین دێ بنـــــە موبتـــــەلا

---

[1] ل جهەکێ دیتر: هوین گوهـ نەدەن چو قەلا.

# زەمانێ ئەم نوکە تێدا[1]

زەمانێ ئەم نوکە تێدا
خودێ بێژی بەحشتە
مرۆڤ چون ژرییێدا
ناکەن شوکرێ نیعمەتە
شەیتانی موهر لێدا
داببینن زەحمەتە
هەمی نعمەت خودێدا
هەمی خۆشی و لەززەتە

ئەڤ سەربەستیا نوکەی
مە چو جار هو نەدیتە
هوسا بی هەی تە هەی
زۆر بوون دز و فەلیتە
برا ما تو تەخمینا ناکەی
تە دین هێلا بێ پویتە
حەقێ خودی ڤێت[2] ئەداکەی
ترسەك مەزن یا ل دویتە[3]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] دڤێت.

[3] ل دویف تە.

خۆشە ئەڤ كوردستانە

هەڕو دەوات و زڕنانە

نێ ئەڤە ئیمتیحانە

ڕۆژ ڕۆژا خورتانە

خودێ خورتێ هەمانە

لەو دا مە ئاڤ و نانە

یێ شوكرێ نەكەت حەیوانە

ل ڤێ دنێ مێهڤانە

كچ و كورێت كوردا

هەمی بوونە ئەجنەبی[١]

عادەتێ كوردا بەردا

وان گوهـ نەدا نەبی[٢]

دێ كەڤن سەد كول و دەردا

بێ توبە ئو بێ تەنبی

شەیتانی ل وان ڕو دا

دا شەرمزارین نك ڕەبی

دێ چ بێژن خودێ

سەركول و مل ڕویس

ئافەرین چوك ڕویسێ كوندێ

تە چ خۆ كربینا مویس

بۆ ڕەقاسێ تو توندێ

---

(١) بیانی.

(٢) پێغەمبەری.

وەیلا بێ ئەدەبا پیس
دوزەخ ئامادەیە ڕندێ

فایدە ناکەن چو فلویس
کچ و کوڕێت مە کوردا

هەمی بوونە عەلمودە
هەیلا ڤی عادەتێ پیس

هەرە عودە[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ب ڤی شێوەی ب داوی هاتیە.

# گازی دکەم موسلمانا[١]

گـــازی دکـــەم موســـلمانا
خودانێـــت دیـــن و ئیمانـــا
دا گوهـــ نـــەدەن شـــەیتانـــا
دا ئـــەو بـــبن بـــەحشـــتێ

قـەد گوهـ نـەدەن هـەوا نـەفسـێ
ژێ فایـــدە نـــەکریـــە کـــەســـێ
بـاش گوهـ بـدەن ڤـێ قـەسـێ
گوهـــ نـــەدەنـــە لـــەعنـــەتـــێ

کـــەســـێ گوهـــدا شـــەیتـــانی
خـــــۆ هاڤێـــــت نیرانـــــی[٢]
بــــۆ ڕوو ڕەشـــێ یـــەزدانـــی
بـــۆ گونـــەهکـــار و بنکـــەتـــێ

ئـــەڤـــە مـــن دوعـــا ژ خـــودێ خاســـت
هـــەمـــی بگـــرن ڕێکـــا راســـت[٣]

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] ئاگری.

[٣] هەلبەستڤانی ب ڤی شێوەی هەلبەست ب داوی ئینایە.

## دلێ من تەژی کول وکۆڤانە[1]

دلـێ مــن تــەژی کــول و کۆڤانــە
یــا ژ هــەمیـا مــەســتر[2] کوردســتانە
یــا ژ وێ مــەســـتر دیــن و ئیمانــە
هیڤیـا مـە ژ خـودێ ڕەحـیم و ڕەحمانـە

ئــەو ڕەحمــا خــۆ ل مــە ببارینیــت
هــەمــی کارێــت مــە بجهـ بینیــت
هــەمــی نــەخۆشــیا هــەلینیــت
کوردســـتانێ بکـــەت ئاڤـــەدارنـــە

ئــەم هــەمــی فــەقیــر و ژارێــت وینــە
مــە ژ غــەیــری وی کــەســەك نینــە
هــەمــی کــەس حــەوجــەئــی وینــە
ل ســـەر هـــەمیـــا ئـــەو خودانـــە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] مەزتر.

# دنیا ملكێ خودێیه[1]

دنیـــــا ملكـــــێ خودێیـــــه
دا هــــــەمــــــی تێـــــدا بــــــژین
نــــێ بـــــەهـــــرا كــــوردا ژی تێـــــه
مــــا بـــــۆچی ئـــــەم ژی نـــــەژیــــن

بـــەرێ خـــۆ بـــدەن حوكمـــەتـــا شـــیعه
ئــــــــەوا نهــــــــۆ ل ئیرانـــــــــێ
دگـــــــەل كــــوردا شــــــەنیعـــــــه[2]
نابێژیـــــت ئـــــەڤـــه مـــــافێ وەهـــانێ

نــــــاڤێ وێ جمهوریـیــــــا ئیســــــلامی
خــــودان مــــــەرجەعیـــــەت و ئیمـــــامی
كوردســــــتان هــــــەمـــــی ب عـــــامی
یــــــا لێدكــــــــەت نــــــەكـــــامی

كوردێـــــت وێ پێـــــنج مــــــەلیــــوونن
هــــــەمـــــی ل دەڤ وێ مـــــــەلعـــــوونن
بزمـــــــانێ خـــــــۆ نــــــــاخوونن
ئـــــو دبێـــــت ئـــــەم خـــــودان قـــــانوون

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] نەباشن.

# کورد ژی وەکی مللەتا[1]

کورد ژی وەکی مللەتا
خودێ یێت ئافراندین
ژ ئێک دوو دگرن عادەتا
دوژمنا ئەم فراندین
کورد ژی وەکی خەلکێ ئادەمینە
بۆچی ل ڤێ دنێ وا ماف نینە
کارێ دوژمنا نە حەقینە
مە د کوژن ئەم ڤەبراندینە
دوژمن بلا باش بزانن
کورد ڕابوون ژ خەوێ
خودان زەربێت گرانن
دێل دوژمنا کەن ڕاڤەکەرێ
دێ سنۆرێت خۆ گرن
ب گوفتوگو و قانوونێ
بۆ شەڕا کورد ئاگرن
تیرور ناکەت هاتن و چوونێ
دوژمنا بڤێت یان نەڤێت
چیا ب دەستێ مە ڤەبێت
دێ مەنعەکەین کارێت کرێت

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

دێ وێ کــەیــن یــا مــە بڤێــت

ســـەبرکێشـــان مـــە بــەســە

کێـــر گـــەهشـــتە هـــەســتی

مـــن نڤیســـی ئـــەڤ قـــەســە

مـــە دڤێـــت ســـەربـــەســتی

کـــورد شـــەعبـــەك عـــەریقـــە[۱]

قـــەدیـــم و زەمـــان یـــا هـــەی

کـــەس بوونـــە بـــۆ ســـەدیقـــە[۲]

بـــێ تفـــاقی مـــە یـــا هـــەی

بـــلا بـــزانن عـــەرەب و تـــرك و عـــەجـــەم

ڕێکـــا بـــارزانی بـــەر نـــادەم

دێ کوردســـتانێ ئـــازاد کـــەم

دێ ڕوحـــا خـــۆ د بـــەردا دەم

---

[۱] کەڤن.

[۲] هەڤال.

# صەدامی خەلیج فرۆت[1]

صەدامی خەلیج فرۆت　　دا شۆڕەشێ ڤەمرنیت

خۆ ب غەزەبا کەرێ سۆت　　دا کەرکووک بو بمینیت

وی پاشەڕۆژ نەزانی　　کا دێ چپ دویڤدا هێت

وەك بەرانەك حەمەدانی[2]　　هێرش برە سەر کوێت

ژ دەست چوو جنوب و شەمال　　ژ هەژمارێ ما وە سەت[3]

کەس نینە بۆ وی هەڤال　　یێ مای ل بەغدا وەك سەقەت

ئەڤە بیست و سێ سالە　　صەدام ڕەئسێ جمهووری

وە قەچاخا ل مالە　　نەچوویە دەولەتە ژووری

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) حەمدان، دکەڤبتە پارێزگەها مویسل.

(3) سەد.

ئەرێ ما ئەڤە حالە

عیراق نهۆ کەتیێ

هەچکو هاتی دەجالە

هەرۆ شەڕ ییێل پێشسیێ

کەس نەمایە خودان جورعەت

ڕابت سەرخۆ عیراق خۆشکەت

خیانەتێ ژێ ببەت

چێکەت باشترین حوکمەت

ل دوماهیکا ڤێ هۆزانێ

ڕەحمەت وەکی بارانێ

ل سەر شەهیدێت

کورد و کوردستانێ

# ئەی گەلی کوردێت هەژار(١)

ئـــەی گـــەلـــی کوردێـــت هـــەژار
پێکڤــە بکــەن ڤێــری و هــەوار
ژ تـــە نـــابن گونـــد و بـــاژار
مـــــە دڤێـــــت حوکمـــــداری

ئـــــەڤ ب هـــــزاران ســـــالە
مـــــە کـــــوردا نالـــــە نالـــــە
دوژمـــــن یێـــــت بووینـــــە پالـــــە
یـــال کـــوردا کـــری تـــاری

ما نـە بـەسـە ئـەم هنـدە ل بـەرپیا
بـلا ئـەم ژی بگـەهـین خۆزییـا
ئـەم ژی وەك خـەلکـێ هـەمییـا
بخـۆ چێکـەیـن دراڤ و پـاری

ئـەم ژی وەك خـەلکـێ مـرۆڤین
خـــودان جهـــ و ئـــاخ و تـــۆڤین
بلا مـە ژی هـەبن تێشـت و فـراڤین
دوژمـــا زێـــدە یـــا دای بـــووری

ئـــەو نـــزانن ئـــەم جـــەهـــوەریـــن

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

دێ سەرێ خۆڕاکەین نامرین
دێ ئاخ و ئاڤێت خۆ گرین
ئەم کوردین ژ ئەسلێ ئاری

مە کوردا زۆر زەحمەتا دیتی
سەرخاترا ڤی وەلاتی
شاهدە بۆ مە پارتی
شەڕێ کری دگەل نەیاری

هیڤیا من هەیە ژ هەمی پارتییا
بەس کوردا بێخن بەرپییا
دوژمنا ڕاکەن ژ ڕییا
پارتی ئاشە هەمی وەرن ئاری

ئەی عەلیێ کوردستانێ
تو ل دونیایێ مێهڤانی
ئو بووی هەڤالێ بارزانی
شەڤ و ڕۆژا بوو ل هاری

# ئەرێ چ بێژم بۆ ئاداری[1]

ئەرێ چ بێژم بۆ ئاداری
تێرا گەلەک خال هاتنە خاری

ئێکێ ئاداری مرنا بارزانی
چو ڕەحمەتێ شێرێ زەمانی

چاردەی ئاداری بوونا بارزانی
هاتە دونیایێ ب قەهرەمانی

پێنجێ ئاداری بوویە سەرهلدان
مللەتێ گرت ڕێبازا بارزان

بیست و ئێکی ئاداری چەژنا نەورۆزە
ڕێبارزا بارزانی گەلەک پیرۆزە

بیست و سێ ئاداری شۆڕەش
ئەیلولێ تێک چوو بوو شەڤا ڕەش

حەفتی ئاداری ڕێککەفتنا جەزایر
ئیتیفاق گرێدا (بعض الخنازير)[2]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەک ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] هندەک بەڕازان.

## سلاڤ ل سەر وەبن گەلی حازرا[1]

سلاڤ ل سەر وەبن گەلی حازرا
دگەل وان یێت هەلدكەن ئاگرا
ل سەر هەڤال و خویشك و برا
ل سەر بچویك و مەزن و كادرا

ل سەر شەهید و سەروەرا
ل سەر پارتی و هوگرا
ل سەر مێهڤان و كاربدەستا خرا
درێژ ناكەم هندی هاتین ڤرا

گوهـ بدەن من گەلی گوهدێرا
دا نەورۆزێ بۆ وە بكەم ئاشكەرا
نەورۆز جەژنە یا شێرە مێرا
كاوەی ناڤێ ل جیهانێ گێرا

ئەڤە دوو هزار و حەفسەد دوو سالە
نەورۆز بۆ كوردا بوویە مالە
حەیفە حالێ كوردا ئەڤ حالە
خراب گوندن دەربدەرن بێ پشت و پالە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

خۆزی مە نەورۆز کربا ب ڕاستی
نە ب برا کوژیێ و ب دل شکەستی
بەس خاڤ بکەن هریا مە ڕستی
دەینن بناغا بەرێت خۆرستی

گەلو درێژ یاڤان هەمی سالا
چەند شەهید مە دانە و گوندماینە ڤالا
ئەرێ ما هوین ناکەن هزر و خیالا
دا نەکەڤین سەد کۆن و چالا

ئەرێ کوردو ما تو تێناگەهی
ماستێ مە شیرە هێشتا نە مەهی
دێ پێشەمانبی ڕۆژا دوومامی
ئەرێ وە ب مللەتی هەیە ئاگەهی

کوردا لەوا کرە شۆڕەش
دا ژ ناڤ دەرکەڤن عەیب و غش
وان دوژمن ڕەڤاند گۆتە وان کش
ئێدی نەزڤرە و هشبە و هش

ئەڤە خۆش ڕۆژە بۆ مە هەلاتی
ڕۆناهی یا دای هەمی وەلاتی
سەرۆکێ شەهیدا نانێ مە یێ پاتی
ئەو شەلێ دریای تو ببێ پاتی

دێ بــۆ وه بێــژم گۆتنــهك (صــهریــح)[١]
پاراســت و درســت گۆتنــهك (فــهصــیح)[٢]
كورد خۆ نهكهن ئێك ئهو نابن (مهلیح)[٣]
عهلی بو وه گۆت ئهڤ قهولێ (صهحیح)[٤]

ڤێــت بــۆ پــارتێ ئــهم ببــین (موطیــع)[٥]
دا نــهورۆزا مــه ببیت بلنــد بیــت (ڕهفیــع)[٦]
گــهر ئــهم نــهبــین دێ بیــت (عیــد الربیــع)[٧]
پاشــی دێ چكــهیــن ڤــی كــارێ (شــنیع)[٨]

دێ بلا ئهم ژی بكهین كهیف و سهیرانا
بــــلا ڤـــــهحــــهویــــن ژ دهر و كولانــــا
دا خــــــلاس ببــــــین ژ دهرد و كۆڤانــــــا
گونــدێت هــهرفتــی یێــل هیڤیــا خودانــا

گــهلــێ كــورد هــهســتێ خــۆ بگوهــۆڕه
بــهســه كوشــتن ئــهڤ شــهروشــووڕه
پێكڤــه دهســتا بكــهن نــاڤ دهســتا
دا ئــهڤ ئــازاد بــهنــه چیــت ژ قــهســتا

---

(١) ئاشكرا.

(٢) ڕهوانبێژ.

(٣) باش، لاو.

(٤) ڕاست و دروست.

(٥) گوهدار.

(٦) بلند.

(٧) جهژنا بهارێ.

(٨) پیس.

مە ناسنامەك یا هەی بەڕلەمانە
دەولەت سەرێ شەهیدانە
ئەم ل پێك هاتنا (واشنتون) مونتەزرین[1]
زۆر پێویستە ئێك دوو بگرین

بۆ پێك هاتنێ وەرن مەیدانێ
دا ئاڤا بكەین ڤێ كوردستانێ
بە سەدا گوندێت ماین نە ئاڤاكری
بلا بەس بمینت پارچەكری

ل دوماهیكا ڤێ پارچە هۆزانێ
ڕەحمەتا خودێ وەكی بارانێ
ل سەر بارزانی و شەهیدێت
كورد و كوردستانێ

---

(1) چاڤەڕێ.

# بارزانی بنگەهێ پارتی دانا[1]

بارزانی بنگەهێ پارتێ دانا
ل شازدەیی تەباخێ
دەنگڤەدا ل کوردستانا
بدەن خۆ هێز و زاخێ
بارزانی پارتی چێکر
ل شازدەی هەیڤا هەشت
وی خەلک گەل خۆ ڕاکر
دا کوردستانێ بکەت بەهەشت
شەقاندن دول و نهال
سەر گر و ڕێهل و ڕووال
زۆرکرن دۆست و هەڤال
پارتی بوو ئاڤەك زەلال
خەلکەك هات و ئاف ڤەخار
شەرمزار بوون خائین و خار
ل کوردستانێ بوویە هەوار
چوون دوژمنا وەك شێرێ هار

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

دەستپێکر شۆڕەشا ئەیلولێ

پێشمەرگە ڕاکر چوونە شولێ

زۆر شەهیدبوون د ڤێ پولێ

چوجار ناهێلین ئەڤێ تولێ

## بخێر بێت شازدەی تەباخێ[1]

بخێــــر بێـــت شـــازدەی تـــەبـــاخێ
بــارزانی وەفـات بـوو بـۆ جهـێ داخـێ
گــەلــی كــوردا بـدەن خـۆ زاخـێ
بیـر نـەكـەن چـو جـار ئـەڤـێ ئوچـاخێ

بـــــارزانی بـــــوو مرۆڤـــــەك زانـــــا
بنســـترا پـــارتی وی بـــۆ مـــەدانـــا
بـــاغێ وێ بـــەلاڤبـــوو ل كوردســـتانا
ڕێكخـــراو دورســـت بـــوون دگـــەل شـــانا

نـــاڤێ وێ دەینـــا پـــارتی دیمـــوكرات
بـو مللــەتــێ كــورد وی كــره خــەلات
بـــۆ ڕۆژەك نـــوی ل كـــوردا هـــەلات
پێشمەرگە شوور بوو چوو قادا خەبات

ڕۆژ بـــۆ ڕۆژێ خـــەبـــات زێـــدەكـــری
پـــارتی پێڤـــە چـــوو وەكـــی ئـــاگری
دوژمنێـــت كـــوردا ژ ترســـا مـــری
بـــارزانی مـــا ســـاخ چـــو جـــا نـــا مـــری

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

پارتی ڕەداهێلان وەکی فریزی
بارزانی تو ڕێبەرەك عەزیزی
کوردا کێماتی نەکریە بۆ ئینگلیزی
نەبوو مەلکا نەبوو سەدام غەلیزی

بارزانی هەر بۆ کوردا سەروەرە
پارتیا وی بۆ مە ڕێبەرە
نیشانا کوردا خەنجەرە
بارزانی بۆ کوردا چەپەرە

پارتی چێبوو ل کاتێت تەنگ و تاری
کێم ئاغایێت کوردا چوونە نەهاری
بەهرا پتر چوون لایێ نەیاری
بارزانی زانا خودا بەریاری

بەری دامەزراندنا پارتی
وی جەولەکر ناڤ وەلاتی
کا دێ کی هاریکەت و بیتە پارتی
گەلەکا نە ژ دل گۆت تو خێرهاتی

هەتا گەهشتە گوندێ بلان
جابا وی هات ژلایێ بارزان
گۆتی وەرە بۆ شەڕ و لێکدان
ل گوندێ بلان زڤڕی بۆ بارزان

## ئەڤ ئازادیا مە دەستپێکە[١]

ئـــەڤ ئازادیـــا مـــە دەســـتپێکە
بــــــۆ ئازادیــــــا مــــــەزن
هێشـــتا ئـــەڤـــە نیـــڤ ڕێکـــە
دڤێـــت ئـــــەم پتـــــر ببـــــەزن

دا بگـــەهـــین ســـەربـــەخـــۆییێ
هێـــژ مـــــە ئاڤـــا ل جـــۆییێ
مـا چ فـەرقـە دیابـەکـر یان کۆییێ
هـــــەر دوو ئێـــــك ڕەگـــــەزن

کوردســـتان یـــەك کوردســـتانە
نـــە وەك پارچـــە کرنـــا دوژمنانـــە
دڤێـت کـورد هـەمـی بـبن برانـە
چنکو هەمی ئارینە و ئێك ڕێـزن

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## ئەرێ ما نە بەسە ئەز ئەزۆك[1]

ئـــەرێ مـــا نـــە بـــەســـە ئـــەز ئـــەزۆك
مـا چـكـو مـە هـەنـە سـولـەيمـانـى و دهـۆك
ئـــەم ل هێڤيـــا ســـولحێ مـــاين پـــەيـــۆك
لـەزكـەن پێـك وەرن ئيـرۆ ڤـەكـريـە دەرۆك

ئـەگـەر مـن گـۆت ئـەز و تـو گـۆت ئـەز
ئاڤـــــا نــــــابن گونــــــد و ڕەز
چـــو جهـــ بـــۆ مـــە نـــابن مـــەركـــەز
دێ نان ل مە بيت هزرەت نابيت سەوكۆك

ئـــــەڤ پێكهاتنــــا هنـــــدەك درێـــــژ
ل مـــــە ئـــــالۆز بـــــوون ڕۆژى و نڤێـــــژ
بـــــلا بمـــــرن دەســـــتێن قرێـــــژ
كـــەتـــن نـــاڤ مـــە بوونـــە شـــالۆك

ئـــەو شـــالۆكێت هـــو بـــێ ســـەقـــا
وان يـــا گوهداريـــە ئـــەحمـــەقـــا
وان گوهـــ نـــەمايـــە ل چـــو حـــەقـــا
دا هـــەر كـــورد بميـــنن گـــەرۆك

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونيشانييە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونيشان هاتيە هەلبژارتن.

ئیرهابیـــــه تـــــو دویڤـــــەلانكـــــی
هـــــەر دوو خویشـــــك و برانـــــه
پـــــارا وەردگـــــرن ب لینكـــــی
وەك پارتیـــــا ئـــــەنســـــارۆك

# قائید نەبوون وەکی بارزانی[1]

قائیــــد نـــەبـــوون وەکـــــی بـــــارزانی
کـــاری حـــەرب[2] و جـــەنگـــا بـــاش دزانـــی
کـــاوەی شـــۆڕەشـــــکر دا فـــــرەیــــدونی
چنکـــو وی دوماهیکـــا خـــۆ نـــەزانـــی

دلێـــــت نــــازك ناگــــــەهــــن مــــرادێ
گاڤـــا هـــــەلکـــــەت فورســــەت زۆدادێ
ژنــــك خوراکـــــەن قــــــەهــــر و عنـــادێ
شـۆڕەشـــکەرێ بـــێ پـارتی نـــا مینیـت ل قـادێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] جەنگ، شەڕ.

# بژیت کورد بژین کوردستان[١]

بژیت کورد بژیت کوردستان
بمریت تیرۆر بمریت تروریستان

بکەن ناڤێکدا هەمی دەستان
دا هەلکێشن ڕهێت تروریستان

لەعنەت ل وەبن گەلی تروریستان
وەب خەم ئێخستین پایتەختا کوردستان

ڕۆژا عیدێ ئێکێ سوباتێ
سەد و پێنج شەهیدێت خەباتێ

وە تیرۆرکرن دژی ئایەتێ
موسلمانێ درەوین خودانێ قەبحەتێ

وە بخۆ دۆزەخ بخو حەلالکر
وە بخۆ بەحشت حەرامکر

وە ب دەستێ خۆ ئاگر ب خۆ هەلکر
مالا خۆ بن لادنی خەرابکر

وە خوینا سەرکردا و خەما وەری
ل پایتەختی ناڤێک هەلکر

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

وە دیارە وە خودێ و ڕەسول ژبیرکری
وە پتر مللەتێ کورد قائیمتر کر

دێ ل کویڤە خۆ ڤەشێرن ل پێشمەرگەی
دێ تە گرن و کوژن وەکی سەی

وە حەرام بیت تو ل کوردا فایدە نەکەی
خودێ حەسبکەت دێ شەرابا دوزەخێ فڕکەی

هەوارا خۆ ببە بن لادنی و زەرقاوی
دا وە ژ دەستێ پیشمەرگا بکەن سەرۆکەی

هەی دوژمنێت خودێ و ڕەسولێ وی
جهێ وە دوزەخە و جەهنەم و هاوی

ژ کوردستانێ دەرکەڤن گەلی ئیرهابییا
دێ پێشمەرگە ل وە بڕن دەست و پییا

ئەگەر هوین موسلمانن هەڕن جوهییا
دا زەرقاوی و بن لادن بەرەن وەرییا

ئەگەر ڕوباد دێل وەرە شکە هەر دوروییا
دێ وە ڕەزیل کەت و بن گۆڕ کەت بن پییا

سامی[1] و شەوکەت[2] بوون شەهید
دگەل هەمی هەڤالا بۆ بەحشتێ بوون عەگید

هەر وەکی بەحسێ شەهیداکری قورئانا مەجەمید
شەهید ساخن نامرن دێ خون و ڤەخون مایرید[3]

---

[1] سامی عەبدولڕەحمان.

[2] شەوکەت شێخ یەزدین.

[3] هندی بڤێت.

# گەلێ کوردا ئێکودوو گرت[(١)]

گـــەلـــێ کـــوردا ئێکـــودوو گـــرت
پیلانـــــی دوژمنـــــا ل نــــاڤ بــــرت
ترۆریســـتا لـــێ بـــووی فرتـــه فـــرت
نزانن دێ کویڤە ڕەڤن ڕێ لێ گرت

کــــورد چــــوون هـــــەلبژارتنـــــا
پێکڤـــه دەنـــگ دان مێـــر و ژنـــا
دێـل تروریسـتا گـرن هـەمـی کونـا
دێ وان ڕەڤیـنن دێ بنـه پرتـه پـرت

دێ کیڤـــــه ڕەڤـــــن ئیرهـــــابی
دنیـــــــا ل وان تـــــــاریبی
چـــــــــاڤ ل وان تـــــــاریبی
ڕێکـــــەك پییســـــه وان گـــــرت

بێپشــــك ئـــەو جـــەهنـــەمینـــه
جهـــێ وا نـــل نـــاڤ مـــه نینـــه
ئـــەو مجـــرومن ئـــەجنـــەبینـــه
عـــەرەب و کـــوردا ئێـــك دوو گـــرت

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## هندی ئەز هزرا خۆ دکەم کا چ بێژم[١]

هندی ئەز هزرا خۆ دکەم کا چ بیژم
بۆ شەهیدێت ئێکێ جەژنێ
نزانم چەوا هۆزانێ دارێژم
بۆ شەهید سامی خودانێ بەژنێ

ل جیهانێ بێ ئاشکەرا بوو
چیا تو بو بێژیێ وەسا بوو
چل و دوو سالا ل خەباتێ بوو
ئازادیا کوردستانێ کارێ وا بوو

ئەز چ بێژم بو کاك شەوکەتی[٢]
خۆشتڤێ ل بەر دلێ مللەتی
ڕەحما خودێ بووی کەتی
هیڤیا من ژ خودێ تو جەنەتی

هەروەسا سەعد عەبدللا
خۆشتڤی خەلکێ ڕوحا دلا
ب راستی وە ئەم ئێخستین کولا
خودێ ژ وە ڕازی بیت بلا

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] شەوکەت شێخ یەزدین.

# ئەز چ بێژم بۆ كوليلكا بۆسەلێ[١]

ئەز چ بێژم بۆ كوليلكا بۆسەلێ
وی دلسۆتن وەكی پەلێ
وەك ئاگرێ ل بن مەنجەلێ
ڕۆندك بارين وەك كوتەلێ[٢]

نەشێم هەمی ناڤا بێژم
هوزانڤانەك بێ ڤەرێژم
ژ كۆڤانا كەڕ و گێژم
ئەگەر باشتر دا پێ بێژم

هێڤيا من ژ خودێ مەزن
بۆ بەحشتێ هوين ب بەزن
تژی تێدا باغ و ڕەزن
ب ئاگری هوين ناگەزن

تيرورست لەعنەتينە
بێ شك خەلكێ ئاگرينە
وان بەهر ل بەحشتێ نينە
كەسێ بێژيت مجاهدن بێ دينە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونيشانييە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونيشان هاتيە هەلبژارتن. مەبەست شەهيد (مەحموود هالۆ)يە.

(٢) دويماهيا وێ جهی يە ئەوێ ئاڤ د گەهيتێ بۆ زڤڕاندنا ئاشی داكو بكار بكەڤيت.

هــوين بــوون شــەهيــد ل ڕۆژا عــەيــد
مــن يــەقينــە هــوين بــوون شــەهيــد
ل پێشـــيا مـــە بوونـــە (بـــەريـــد)
چـــوون نـــك بـــارزانيێ (قائـــد)[1]

هـــوين بـــۆ كـــوردا بوونـــە چـــرا
وە كـــورد هـــەمـــى كرنـــە بـــرا
دەنگـــێ هـــەوە چـــوو خـــر درا
هـــوين چوونـــە ڕێـــزا نـــەمـــرا

---

[1] پوست.

# هەوار بەقالا ئەم خرابکرین[١]

هەوار ڤا بەقالا ئەم خرابکرین
ناهێلن ئەم دینارەکێ هەلگرین

دێ هێن سەرێ کولانێ هۆڕن دێ زڕیت
کوڕ دێ ڕابیت بەزیت کچ دێ گریت
کچ دێ سەرێ دایێ ڤەچریت
ئیلا تشتەکی بۆ بکریت

گاڤا گازیکر های مۆت
دلێ بچویکا بۆ سۆت
پێکڤە دێ کەن بۆت بۆت
ل مال نەمایە نە دینار نە بەنقەنۆت

گاڤا هاتن گوندۆر
پێکڤە دێ کەن بۆر بۆر
بابێ نینە فلسەك سۆر
عەیال هەمی دێ چن دۆر

دای گوری مەعاش نینە
باب فەقیرە نە زەنگینە
دا ئەز نزانم هەرە بینە
من دڤێت دلێ من نەشکێنە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

گاڤا هاتن زەبەش
دەڤێ هەمیا دێ مینیت بەش
دایێ هەرە بکرە خوەش
ئەگەر دێ تە کەم کەلەش

گاڤا هاتن باجانك و بامی
بچویك دێ ڕابن ب عامی
چەند دخۆشن ناڤ تەعامی(١)
ئەگەر تو نەکری دێ تە بەم دەڤ ئیمامی

گاڤا هاتن پتات و خیار
پێکڤە دێ کەن هەوار
دایکێ وەرە کا دینار
ئەگەر نەکری دێ کەم قار قار

گاڤا هاتن تەماتە
دێ بکرن دا بکین زلاتە
نێ ئەڤە خۆش عادەتە
وەی بۆ تە بمریت دا تە

دویڤرا هاتن کوراد و پیڤاز
نێ ئەون بۆ مە داخاز
دێ پێ بینە سەرفەراز
ساڵەك دی تەژی دێ بم وەراز

گاڤا هاتن مژ مژە و حولیك
پێکڤە دێ ڕابنە سەر خۆ بچویك
بابێ پارە نەمانە خالیە بەرویك
پێکڤە دێ خو گەڤزینن دێ کەن فیك فیك

---

(١) خوارن.

گاڤا هاتن سێف و پرتەقال
پێکڤە دێ کەن گال گال
دای گوری فلسەك نینە ل مال
وەرە هەرۆ هەین بکە وێهە بەقال

گاڤا هاتن هنار و مۆز
پێکڤە بۆ چو دەیك دێ ڕابن بن کەرمۆز
ئەو دێ ڕزن وەکی کەرێ بۆز
دایێ وەرە بکڕە ئەگەر دێ خۆ کەینە تۆز

گاڤا هات سەیارا دودورمە
بجویك دێ کەن بورمە بورمە
دێل دایێ کەن گورمە گورمە
ڕوینن دایێ ما هوین بووینە جەدرمە

# زۆر سلاڤێت برا ڕوبادی[1]

زور سلاڤێت برا ڕوبادی
بۆ وان خویشکا یێن چێتکەن زادی
هیڤیدارم خۆش پاقژیێ نە بادی
ئامانا باش بشوو قرێژی لادی

ئەگەر تە بڤێت زادی باش چێکی
شینکاتیا باش بشوو تازە هویر هویرکی
بکە ئاڤکێ پیڤاز و بامیا و باجان ڕەشکی
دا ئەڤسەرێ تە ل تە نەکەت چ طرشی و توندی

گاڤا هوین چوون ناڤ مەتبەخا
بەرێ خۆ بدەن هەمی ڕەخا
باش بشوو دەستا چێکە ئیپراخا
حەشینە باجانکا دگەل کولندی

زادی خۆشە دگەل زرزەواتی
دەینە بەرمێهڤانا نانێ تەنك پاتی
ل هەفسەرە ڕێ خۆ باش بکەماتی
بدێ بتاتا و پیڤازا و گوشتێ قەلاندی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

## خۆ بکەنە ئێك وەك دوو برا[١]

خـــۆ بكـــەنـــە ئێـــك وەك دوو بـــرا
پێكڤـــە هـــەڕن ســـەر چـــەپـــەرا
دوژمـــــن نــــامينن ڤـــان دەرا
دێ بـــن حـــەجييـــت بـــەيتولحـــەرام

بـــلا معاشـــێ وان وەك ئێـــك بيـــت
بـــلا كـــەس ژ كـــەســـێ زێـــدە نـــەبيت
دا دلـــێ كـــەســـێ ب عـــەمـــە نـــەبيـــت
دا عــــــەيــــــالێ وارا زيبيـــــــت

كەس نزانت ناڤێ جانا من كوسانە
نـــاڤێ جانـــا مـــن كوردســـــتانە
ســـەرۆكا خـــەلكێ هـــەمـــی جيهانـــە
كـــەســـێ وەك مـــن مـــافێ وی نـــەدانـــێ

ڕوبـــادی تشـــتـــەكـــێ گـــۆتـــی
وی دلـــــێ دوژمنـــــا ســـــۆتی
دژومنـــێ هـــەســـيتێ كـــوردا ڤـــەروتـــی
بـــەلـــێ هێـــژ يێـــل نيڤـــا ڕێـــێ

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونيشانييە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونيشان هاتيە هەلبژارتن.

گاڤا تـو چـووی پشـت كورسـيكێ
بكـــــه هــــــزرا دوومـــــاهيكێ
نــه ڤرِكــه ماشــێ ب هــهســكويكێ
بكـــــه هـــــــزرا جيرانـــــــا

## ناڤێ نەورۆزێ نوی ڕۆژە[۱]

نـــــاڤێ نـــــــەورۆزێ نـــــــوی ڕۆژە
جـــــەژنـــــا کــــــوردێ دلســــــۆژە

ڕۆژەکـــا نـــوی بـــۆ کـــوردا هـــەلات
ژیـــەر هنـــدێ بـــۆ جـــەژنـــا وەلات

ضەحاکی نە دهێلا وان هەبیت ڕۆناهی
کـــاوەی ئـــەو کوشـــت ب ســـاناهی

نــــەورۆز جـــــەژنـــــا ئاریـــــە
هــەر ســال هــەمــی دکــەن شــەهیانــە

هـــەلکـــرن ئـــاگری نیشـــانا وابـــوو
گاڤا ضـەحـاك کوشتی ئیعلامـا وابـوو

عــەرەب دبێــژن کــورد ئــاگر پــەرێســن
بــەلــێ وە نینــە ئیســلام پــەرێســین

ل وی کاتیــدا نــەبــوون تێلــەفــون
خــر دددان ئێکــودوو ب هــاتن و چــوون

کــاوەی گۆتبــوو هــەمــی لــەشــکەرا
کــو ئامـــادەبـــن ل هـــەمـــی دەرا

---

(۱) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

کـاوەی هێـرش بـر سـەر ضـەحـاکێ

ل دیفـاعێ کوشـت بـێ تـرس و پـاکی

وان ئـاگر هـەلکـر سـەربـانێ حـەوالـێ

زولـم وان ڕاکـر ئـازادی هـات حـالێ

# خۆ هشیارکە عەبدێ خودێ[1]

خـــۆ هشـــیارکە عـــەبـــدێ خـــودێ
هـــەمـــی بـــۆ ڕاڤێـــت لێنـــەدێ
هـــەمـــی کـــارا خـــۆ لێنـــەدێ
داتـــو د ڕێکـــا ســـەردا نـــەچـــی

کـــەســـێ چوویـــە ڕێکـــا تـــاڕی
دێ سـەر شـووڕ بـت نـك جـەبـاری[2]
کـــەســـەك نینـــە بێتـــە هـــارێ
کـــو کـــارێ وی بکـــەت بـــەجـــی

ئـــەســـلێ تـــە ئـــەوەلـــی ئاخـــە
تـــو مریبـــووی کـــری ســـاخە
هـــوین کـــرن مـــال و ئوجاخـــە
تـــو ئیـــرۆ هنـــدە حـــەراجـــی

ســـەر تـــە فـــەرزن ڕۆژی و نڤێـــژ
بـــەس ئـــاڤ ڕوییـــا خـــوون بڕێـــژ
بشـــــو دلـــــێ ڕەش و قرێـــــژ
دا ل جـــەهنـــەمـــێ نـــە بـــەعجـــی

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (خودان هێز وشیان) ددەت.

گاڤا کەتی ناڤ نقینێ
عەرز و عەیال دێ کەت شینێ
عەمەلێت خوە تو دێ بینێ
یان تو گەشی یان قورمجی

گاڤا عزرائیلێ تە هات
ژ تە ناهێت قەت چو خەبات
دێ تە گریت ئەو سەکەرات
رێکەك نینە پێڤە بچی

مار و کرم مونتەزرن
بۆ وان کەسا وەك تە د مرن
دا دورانا خۆ ل تە بگرن
هلۆ لەزکە ببە حەجی

# پارتی بەحرەكا كویرە[(١)]

پارتی بەحرەكا كویرە
بارزانی مەلەڤانە تێدا
حسابا وێ گەلەك هویرە
گاڤا خەلەت كەتە تێدا

قوچا پارتی یا كەڤرانە
یێ خۆ لێدا ئەو نەزانە
ئەو ما بێ رێك و كولانە
دێ رەزیل بت ددنێدا

گەلەكا یا خۆ تاقە كری
شەرێ ل گەل پارتا مە كری
پاشی یا مای ب دەستی گری
وەك هندەكا د حەپسێدا

پارتا مە دیموكراتە
بۆ مللەتی ئەو خەلاتە
زۆرا ب خێر و بەرەكەتە
كەسێ ساخ لەم بێتە تێدا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

پارتیـــــه ڕوحـــــا مللـــــهتــــى
ئــــهڤــرۆ باشــا بـــۆ هـــهلكـــهتـــى
ئـــــهو ئاڤـــــا دكـــــهت وهلاتـــــى
ئیــرۆ كارگــهه‍ــ كــهتــن تێــدا

# مرن کەسی نا هێلیت[1]

مـــرن کـــەســـێ نـــا هێلیـــت
مـــــــــرادا دلا دهێلیـــــــــت

مرنـــا بـــێ فـــەرق و جـــوداهی
مـــە هـــەمیـــا دێ بـــەت دوومـــاهی

نـــە مـــەزن و نـــە بچویـــك
دێ بـــــۆ مرنـــــێ بێچویـــــك

نـــــەزانـــــا و نـــــەزانـــــی
مـــــرن دێ بیتـــــە مێهڤـــــان

مـــــرن دائـــــیم حـــــەرەســـــە
گاڤا عەمر خلاس ناهێت نەفەسە

ئـــەم ب دونیـــایێ ڤـــە مـــژویلن
گاڤـــەك دی گـــورێ د کـــولن

نـــە قائیـــد نـــە جنـــدی
کـــەس نابیتـــە ئـــەفـــەنـــدی

هـــەمـــی دێ چـــین نـــاڤ ئـــاخێ
نـــازڤڕین ل ڤـــێ کمبـــاخێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

دونیـــــا زۆر حیلـــــەكـــــەرە
بـــۆ كـــەســـێ نابیـــت مـــەقـــەرە

چـــــل پالێـــــت عزرائیـــــل
ئـــــەو حـــــازرن وەك فیلـــــی

گاڤـــا گـــۆتێ هـــــەڕنـــێ
وێ گـــــاڤێ دێ دەنـــــێ مرنـــــێ

عزرائیـــل دێ دەســـتی درێـــژ كـــەت
مرنـــێ دێ ل مـــە هـــەلكـــێش كـــەت

نــــــە مـــــاقوول و نـــــە ئاغـــــا
ئـــــەو نـــــاینن ل بناغـــــا

كـــــەســـــەك نابیتـــــە مـــــانع
گاڤـــا هـــات مرنـــا قـــاطع[1]

چـــاڤ دێ كـــەڤـــن ســـەرێـــك
یـــــا دویـــــر و درێـــــژە ڕێـــــك

مـــــزگین بـــــۆ مرۆڤـــــێ بـــــاش
نـــەخـــۆش دێ لـــێ چنـــە پـــاش

بــــــــۆ خرابــــــــی ڕوی ڕەش
هـــەمـــی نـــەخـــۆش دێ چـــن پـــێش

---

[1] بێ هرڤە و وێڤە.

# جەماوەرێ باتیفا خۆڕاکر[١]

جەماوەرێ باتیفا خوڕاگر
بارزانی یا ب وە ئینا باوەر

جەماوەرێ خۆڕاگرتی
هوین پارتینە دەنگا بدەن پارتی

دەنگا بدەن لاو و پیر
بۆ پارتی ببن دەستەگیر

گازیا من بۆ وە هەمییا
دەنگێ خۆ بدەن پارتییا

ل سالا چل و شەشێ
کیبوو چوویە ناڤ ڕۆسی

بارزانی بوو سەروەرێ شۆڕەشێ
کورد مان ڕویس و برسی

ئەوی نەبوون چوو بەدیل
کورد هەمی مان بێ دەلیل

هەتا سالا پێنجی و هەشت
بارزانی جارەك دی گەهشت

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

ئەوی ڕاکر شۆڕەشا ئەیلولێ
دەنگڤەدا وەکی دەهولێ

دوژمنا ل مە ڕاکرن ئەنفال
ئەم پێکڤە بووینە هەڤال

بلا ئەم پێکڤە برا بین
ل سەنگەرا پارتیێ نە ڕابین

ل وەختێ جەنگ و حەربا
هەر پارتی بوو خو دا بەر دەربا

چو مال نینن ئیرۆ بێ شەهید
نوکە هندەکا یا خوری عەگید

نەخون نانێ عیسای
دوعا بکەن بۆ موسای

# مرۆڤ ساخ بیت هزار سالا[١]

مرۆڤ ساخ بیت هزار سالا
دێ هەر مریت
گوهـ نەدەن مال و حالا
بۆ حالێ خۆ بلا بگریت

ئەڤ ساخییە ئیمتیحانە
ل سەر دونیائێ
گاڤا مرن هات بێ ئەمانە
بلا رێکا تاعەتێ بگریت

رێکا ئازادیێ تاعەتە
دنیا گرتن پوپچە و سەفاهەتە
هەچێ ژ مە گرت خوسارەتە
چو رێ نینە پێڤە ب رەڤیت

دڤێت ئەم خو هشیارکەین باش
خۆش تاعەتێ نەدەینە پاش
هەبوونا مە ناچیت بەلاش
خودێ مافێ خۆ شمە[٢] دخازیت

---

[١] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[٢] ژ مە.

## زڕباب[1]

گریا مە تێت بۆ بابێ
مر ئەم کەتین عەزابێ
کی ل من دکەت عیتابێ
زڕبابە بۆ ئەهالی

خارن بە دەست و دانە
عەبدینی هۆ ب ژڤانە
دای بێ ژنامە جانە
بەر هندەکا تو نالی

ئێتیم کەتینە گوندا
تەشبیهی پۆر و کوندا
نێ ئەڤ عەزیزە مندا
بۆ صنفێ هەژدە سالی

بەلکی بکەن خەباتێ
دوژمن نەچیت مەلاتێ
ملکێ نەیار کو هاتێ
کەفتن ژناڤ و حالی

پیر و مەزن د خەو چوون
حال خۆش و دل قەلەو چوون
زڕباب نەهشت و ئەو چوون
هنبان مە مانە خالی

---

(۱) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ یە.و ناڤونیشانییە.

کێلانە باغ و بیستان
دەشت و چیا و زۆزان
قوت و نقینك و حەیوان
ستاندن هەمی ب گوپالی

ملکێ بخۆ وە کێلای
ئەو بێدەرا وە دا بای
هندی شریك بخۆ شیای
ڕادا دەرێ جوهالی

چەندی ل خۆ نەپرسی
نانێ تەما بترسی
لازم نەهۆ ب ترسی
بێ مام خزم و خالی

تو ژ ئەقل نەی تەمامی
لەو دائیمەن خولامی
بێ حوکم و ئینتزامی
بێ قەوم و ملك و مالی

فەخرا تە مەرحەبا بیت
بێ کورك و بێ عەبابیت
مەعیەن جهێ تە نابیت
تو ب ڤێ نەبوویە والی

هندی کەسێ بیانی
نویشێ نەدە تو خانی
دێ بیتە پیشەمانی
وەقتێ تە بر ملالی

## کەتم خەما فەتاح گولی[1]

کەتم خەما فەتاح گولی[2]
گری ئێخستە دلی
بەلێ چپکەت مەلا عەلی
مرن حەققە بێ عینادە

پێشمەرگەکێ شێرانە بوو
مێرخاسەکی میرانە بوو
کەسانەکێ وێرانە بوو
چ مرۆڤەک سیفەت کوردە

گاڤا دکەت جەنگ و شەرا
سەر چەپەرا ئەو د گەرا
دوژمن د ڕەڤی وەکی کەرا
چوجا ترسێ نە ڕەڤاندە

قائدەکێ لەشکەری بوو
خودان جەرك و خودان روی بوو
ل هێرشا پێشاهی بوو
بۆ مێران یێ هەما هندە

---

(1) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(2) فەتەح گولی ل سالا (٢٠٠٧) مالئاڤایی کر.

گەلەك جارا بریندار بوو
سستی ل وی نە پەیدا بوو
ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زیرەكتر بوو
هەتا ڕۆژ چوویە دگوردە

فەتاح مر ب مێرانی
چو بۆ مێهڤانێ بارزانی
كو كوردینی یاپ وی زانی
پێت خوریت كەوێ ڕوبادە

وە پیرۆز بیت ٢٦ێ گولانێ
ڕۆناهی دا هەمی كوردستانێ
وێ دەنگڤەدا ل هەمی جیهانێ
نو ڤەكر شۆڕەش شێرێ بارزانێ

چریسكێ ڤەدا ل كوخێ كوماتە[1]
هورمێن و گورمێن كەتە وەلاتە
خائین ڕەڤین گۆت عزرائیل هاتە
پێشمەرگە ل دویڤ چوون هەتا دوبانێ[2]

بارزانی چێكر قیادا بەروەخت
پێشمەرگا هەلگرت تفەنگ و رەخت
هێرش برن سەر بەعسا بێبەخت
وا ب سەرێت خائینا كرە هۆلانێ

---

[1] چیایێ (كوماتە) دكەڤیتە سنۆرێ قەزا (بیت شەبابێ).
[2] دەشتا (دوبانێ) دكەڤیتە دەڤەرا (سلێڤانەیان).

هـــەتـــا نوكـــە يـــا بـــەردەوامـــە
ئـەم كـرين حـەكمـەت فيـدرالى دامـە
ســەروبـــن كـــر حـــوكمێ ســـەدامـــە
بـــەعسـا ئـــەفلـــەقـى بـره نـــەمـــانێ

ئازاديـــا نهـــۆ ئـــەم كـــەتـــين تێـــدا
شـــەهيـدێ عـــەگيـد خوينـا خۆلێــدا
ئاســـتەنـــگ ڕاكـــرن نـــەمـــان د ڕێـــدا
خـــودێ بـدەت وان بـــەحشـــت و ئيمـــانێ

گـــەلـــى كـــوردا بپـــارێزن دار و بـــارا
وان ئـــەمێـــت پاراســـتين ژ نـــەيـــارا
وەكـــى د هـــاتن ڕەفێـــت تـــەيـــارا
مـــە خـــۆ د ڤـــەشـــارت نـــاڤ بـــەر و دارا

گـــەر مـــە نـــەبـــان ئـــەو كـــەڤـــر و تـــراش
دوژمنـــا خـــۆش مـــە نـــەددا پـــاش
دار و بـــــارن بـــــۆ مـــــەعــــاش
مـــە دكـــرن داريـــەســـت بـــۆ برينـــدارا

گـــەر مـــە نـــەبـــان دار و بـــار و چيـــا
كـــەس ژ مـــە نـــە ڕادبـــوو ســـەر پيـــا
بالـــەفـــر دا مـــە كـــوژن هـــەميـــا
مـــە نـــە د شـــيا بكـــين چـــو شـــەرا

وان خـــو بـــۆ مـــە كـــر ســـەنگـــەر
مـــە پێشـــمەرگـــا خـــۆ ددا بـــەر
مـــە بـــۆ دوژمنـــا نـــەهـــێلا مـــەفـــەر
ســـەد گـــوڕ بـــابێ تـــەيـــارا

گەر مە نەبان ئەو دار و بەر
کێم مرۆڤ دابن لەشکەر
بۆ مە نەدمان چو مەفەر
دا مە بەن بەر قنارا[1]

چیا و دارا کورد خودانکرن
ئەگەر ئەو دا ڤەرن
خەلکێت دەشتا ئەنفالکرن
کوم کوم کرنە د ئاخێرا

ئەز مەمنونم ژبۆشی
وی بۆ کوردا کر خۆشی
سەدام بر ناڤ گلێشی
کورد هۆ بوونە ئاشکەرا

---

(١) سێدارەدانێ.

## مه هەمییا[1]

تركومـــــان و عــــەرەب و كــــورد
مـــەســـيحى و ئاشـــورى و كلـــد
برايێـــت ئـــێكن ل يـــەك گونـــد
مـه هـەميـا يـا كـرى لـەشـكەرى

(۱) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونيشانييە، لێ دەستپێكا مالكا ئێكێ وەك ناڤونيشان هاتيە هەلبژارتن.

## ئەول بە حەمدا خودێ[1]

ئەول بە حەمدا خودێ
شوکوردام هەر دەوام
نەفسا خەبیس مفسدێ
ئیسلاحێ ناکەت تەمام
شولا حەقبیت گوهـ بدێ
ئەی مەجلسا پڕ زەلام
پاشی صەلات و سەلام
هەر ل سەر محەمەدی
ڕەسولێ خەیرولئەنام[2]
کەسێ وەسا کەس نەدی
ل سەر وی نعمەت تەمام
ئوممەتا وی موهتەدی
پاشی ل سەر ئەصحابا
شەمالێت هیدایەتێ
ئەهلێ سوئال و جابا
بۆ نەفعێ ڤێ ئوممەتێ
خۆزی ئێک ژ وان مابا
بۆ دوژمنی و هەیبەتێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

[2] باشترینی مرۆڤان.

ئەما قورئان حازرە
دگەل شێخ و عالما
هەر خودێ ل مە نازرە[١]
شول بەیان بوون ما چما
دینێ مە چەند فاخرە
گەلی میر و حاکما
گوهـ بدەن بەلاغەتێ
دا ئەز بەردەم ئەزمانی
ڕووسپی یە ل قیامەتێ
کەسێت شولا خۆ دزانی
خودانێت ڕیاسەتێ
هەر دێ بن سەرۆکانی
هندی سال و زەمان
هەنە ئەهلێ عەقل و عار
ڤێت باشیا خۆ بزانن
هێژ ڕۆژ نەبوویە ئێڤار
شول بووری د پەشێمانن
بێ فایدەیە ل وان هەوار
پاشی نەسحەتێ ئەو ما
بەیان بکەم مەرتەبا
ئەز فکرم هەمی قەوما
چەوا بوون تشت و تەبا

---

(١) چاڤ ل مەیە، بەرێ ئەوی ل مەیە.

کەس نەدەن تەعن و لەوما
عەقلێ من بائی سەبا[1]
عەقلێ منێ دژوارە
ئەم کوردین د نفرینێ
ڕۆژ هندە ل مە ئێڤارە
درەنگە ل فرافینێ
بۆ زفزتان یا سارە
خۆزیا مە هێت هاڤینێ
کوردا عەقل و مەعریفەت
ژ عالەمێ د زێدەنە
هەمی عەشیر و مللەت
بێ عەیب و گازندەنە
بەسە بۆ وان ئەو جیهەت[2]
کوردا چیا مەوتەنە
ئەول فکرن مالباتا
خودانێت کوچک و سەرا
شەمال دانێ ل چڤاتا
ئیمامێت سەر مینیەرا
چ بێژم بۆ وان زاتا
هەمی دبینن ئاشکەرا
بەرێ خۆ بدەن ئامرا
ژ ڤان کوردێن چاڤ بەلەک

---

[1] بایێ سپێدەهیان.

[2] ئالی.

دا یەقین بکەن برا
مارێ ڕەشن بووی خەلەك

خودێ ل وان هەلکر چرا
ئینسانێ سیفەت[1] مەلەك

کا فەکرن ئاغا لەرا
کەلێت ئاسك و غزالا

بێهنا مسك و عونبەرا
ل بەر سنبێل و خالا

ئەون ئەهلێ خەنجەرا
چەك و شیر و مەتالا

ڤێت کوردا هوین بناسن
پێ بکەن ئیمتیحانێ

دا بزانێ ئەو مێرخاسن
خەلکێ دی مروەت کانێ

هەمی شێر و ئەلماسن
دەرکەفتین ژ کارخانێ

چ لاون چ قیر چاکن
بەژن ڕاست و ڕوح شرین

بۆ دوژمنا هەلاکن
شێر و پلنگن نەهین

خودان عەقل و ئیدراکن
هەر بۆ کوردا ئافەرین

---

(١) خەسلەت.

گوهێ خۆ بدەنە دەنگی
شوبهی پیکا زڕنائێ
ئەو هەیکەل و ئەو شەنگی
کەسێ نینە ل دونیائێ
خولکێ وان ل سەر ڕەنگی
خودێ نهایەت دائێ
وان هەبوون شێخ و وەلی
سەر ئوصولا دینی
شوبهی ئیمامێ عەلی
بوونە حەق وخائینی
شولەك دیارە و بەلی
کوردن بو روی شرینی
ئەگەر هندەك دەعواکەن
کو ئەم وەکی کوردا نین
ڤێت عنادێ ژ ناڤ ڕاکەت
دا ئەم بەیانێ دانین
بلا خۆ ئاشکەرا کەن
دا مێرخاسا ببینن
ئەگەر هەما دەعوا بیت
نەهێتە بەر مەحکەمێ
مەدحە وەساچێنابیت
ئەز گوهێ خۆ نادەمێ
حەتا قیامەت ڕابیت
درەوکەر دێ خون غەمێ

ئەزم ئەڤرۆ دەعوەدار
کوردا مقابل نینن
مێرێت وان ئێك و هزار
هین وا ل شەڕا دبینن
وەختێ حەقی هات دیار
دوژمن سەری دچەمینن
کوردستان تو شەمالی
هەلناکەن چو شارەزا
تو ژ دوهنی مایە خالی
کەسپا تە چو بێ جەزا
جهێ بێ خودان نالی
وەختە ل سەر بیت جەزا
کوردستان تو نوو بویکی
ئەز چو زاڤا نابینم
نەیا ب عەیب و چوڕیکی
ڤێت مەدحێت تە بخوینم
بۆ ڕەڤانێ نێزیکی
وەی ئەز بۆ تە نەمینم
کوردستان تو یا جانی
کەس نەهاتە مەیدانێ
موستەحەقا لاوانی
سنبێل ڕەشێت دیوانێ
هەر من قەدرێ تە زانی
چ بکەم نەختێ تە کانێ

کوردستان تو یا ل حینێ

چو کەس ناکەن خەباتێ

ڤێت خوش مێرەك تە بینێ

چاڤێت کەفتین جڤاتێ

تۆ ل قووەتا من نینێ

ئەز چ بکەم ئیلتیلفاتێ

کوردستان تو چەندا باشی

ئەز حەقێ تە دنیاسم

کا چەوا چێکەم ئاشی

برسی و ڕویسی و پێخاسم

ئەما چ بێژم پاشی

کەس نابێت ئەز مێرخاسم

کوردستان ب جەمالێ

سەرێ ژ هەڤالا ستاندی

شەرمە کەس نەهات حالێ

لاوا پەردا دڕاندی

خازگین بیانی ل مالێ

بابێ مای سەر چاماندی

کوردستان یا ل بەر شویا

بەرێ خۆ بدەن طالبا

گولا گەشە ل ناڤ چیا

چاڤ لێ د زلن غالبا

کەس نە ڕابوو سەر پیا

خۆزی هەڤکوفا مەبا

## خۆ هشیارکەن دۆست و یارا[(١)]

خـــۆ هشـــیارکەن دۆســـت و یـــارا
خرخـــڕا مشـــکانە ل بـــن دیـــوارا
ل خـــۆ هشـــیاربن ڕێ نـــەدەن نـــەیـــارا
ڕێکـــا لێبگـــرن نازکـــەن نـــەیـــارا

وە ئـــەڤ ئاگـــەهداریـــە بهیســـت
ژن و مێرێـــت بـــین تروریســـت
ئـــەو دکـــەن چیـــا بـــۆ وان پێویســـت
پـەقانـدن ل نـک وان یـا بـی خۆشەویست

ژ کـــوردا ژی هـــەنـــە خـــۆ فرۆشـــن
کـــێمن نـــە گـــەلـــەك بۆشـــن
ملـلـــەتـــێ خـــۆ بـــو دوژمنـــا فرۆشـــن
ل سـەر دنیـائێ و بـن دنێـائێ ڕوو ڕەشـن

خیانـــەتـــا جاشـــا ل کـــوردا کـــری
ب ســـەدا ل نـــاڤترا شـــامان مـــری
وان ڕێـــك بـــۆ دوژمنـــا ڤـــەکـــری
دا بـێن نـاڤ گونـدا بـەردەتـێ ئـاگری

---

(١) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

من چو جهـ نەڤێن ژ کوردستانێ پێڤە
بـزانین کـاروانێ خـودێ بـەم ب ڕێڤـە
نـــاهێلم دوژمـــن بێتـــە هێڤـــە
ئـالایێ کـوردا دێ ڕاکـەم ش[1] پێڤـە

ڕەبـــی تـــە یـــا حـــەســـکری
کـــو تـــە مـــرۆڤ چێکـــری
بـــلاش[2] ترســـا بکـــەن گـــری
دا وا نـــــەبـــــەی ئـــــاگری

---

(١) ژ.

(٢) ژ.

## وەرن دا بچین جویدێ[1] مرادا[2]

وەرن دا بچین جویدێ مرادا
ژێ بکین بەحسی ئەکرادا[3]
کاکی قەدیم مایە د ڤرادا
دێ بێژیت ئەڤە کوردستانە

سام و جام و یافس[4]
یێل جودی ژێکڤەبووین
گەلی دوژمنا بەس ببن مونافس[5]
کوردستان جهێ کوردانە

ئەڤ عالمە هەمی
عەیالێ ڤان سێ برانە
شاهدی من و هەوە گەمی
بەس مە بکرن ترانە

گوهـ بدەن من ڤێ قەسێ
کوردستانێ نادەینە کەسێ
ئەزمانێت درێژ دێ برین ب مەقەسێ
دا باش بزانن جیرانە

---

(1) چیایێ جودی.

(2) ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

(3) کوردان.

(4) کورێن نوح پێغەمبەری (س).

(5) هەڤرك.

بـــەرەكـــەتـــا نـــەبـــى نـــوحى
هـــات ســـەر جـــودى بـــۆ ئیســـلاحى
گونـــد ئاڤـــا كـــر كـــره نـــاحى
نـــاڤێ گنـــدى هـــەشـــتییانه

بـەرێ خـۆ بدە تـەفسـیرا ئیبن كـەسـیر
كـا بـۆچى هـات وێـرێ نـەبـى بـەشـیر
خـــودێ بـــۆ دەینـــا ئـــەو تـــەكبیـــر
ژێـــەر زولْمـــێ ڕاكـــر كۆفانـــە

ژ وەختـــێ كـــاوەى هـــەتـــا نوكـــە
كـــورد یێـــل بـــن زولْمـــا جیرانـــا
خوینـــا كـــوردا وەكـــى جوكـــە
دەشـــــت وچیـــــا ئاڤدانـــــە

ئـــەڤـــە دوو هـــزار و حـــەفســـەد ســـالْە
كوردیـــت ماینـــە ل بـــن دەســـتا
وان نـــە مالـــە و وان نـــە حالـــە
نوكە ژى جیران یێت بێژن مافێ وان نەمانە

ئێـدى كـورد قـەبـوول ناكـەن د بنیـڕا
بمیـــنن بـــێ مـــاف و حـــەق و حقـــوق
دێ خیانـــەتـــێ بـــڕن د بنیـــڕا
وەلـــــەو بمیـــــنن ئێكانـــــە

ئـــەڤ ژیانـــە بۆچیـــە هـــەبێـــت
وەكـــى مـــاف ل دنیـــایێ نـــەبیـــت
كـــورد دێ خـــۆ ڤـــەبرینیـــت
دێ مـافێ خـۆ بـدەسـت خـۆ كـن ئیعلانـه

عـــەلــــی تــــە قـــەلـــەم کــــر بـــاروٚت

تــــــە دلــــــێ دوژنـــــــا ســــــوٚت

تــــــە پێنوســــــێ خـــــوٚ کــــــر بـــــزوٚت

تــــــــە ڕوٚنکــــــــــر کوردســــــــــــتانە

## بۆ کوردستانێ[1]

بۆ کوردستانێ
ئەز بووم پەروانە
گەراندم ل جیهانێ
کەس ل من نەبوو خودانە

ئەز مام گێژ و شەیدا
کەس خۆ ل من نە هایدا
هەجکو کەتیم داڤ و قەیدا
کوردستان سوجێت تەنە

بلا کوردستان من قەبۆلە
کو تە دای من ئەڤ شۆلە
بلا بۆ تە ببم کۆلە
کوردستان یا کوردانە

دێ گەڕم و نانڤم
خودان قەلەمە و گڤ گڤم
دێ دوژمنا هنگێڤم
هەتا بەیان بیت دەرمانە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

# ئەز پێشمەرگێ کوردانم[1]

ئەز پێشمەرگەمە پێشمەرگێ کوردانم
خودان ڕێباز و خودان دین و ئیمانم
ئەز ڕێبازا سەرۆك بارزانی دزانم
ئەز بۆ ئاخا کوردستانێ پێشمەرگە و بەرەڤانم

ئەز پێشمەرگەمە خودان دۆز و خودان باوەر نەی بەلاشم
خودان چیا و خودان ڕووبار و خودان دەشت و تڕاشم
ئەز دژی خودان ڕهێت درێژ و درەوکەرێت داعشم
ئەز پێشمەرگەمە خودان قورئان و خودان حەدیس و باشم

سەرانسەری دنیایێ ناڤێ پێشمەرگەی بلندبوو بو ئالا
دوژمنو نەیاربوو پێشمەرگەی بوونە شاهد چەپەرێت داعشا مان ڤالا
ب هاریکاریا خودێ مەزن داعش دێ ڕەڤن و دێ چن دەست ڤالا
داعش نەدزانی کو پێشمەرگە هندە پلنگ و شێرن شیر حەلالا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە بێ مێژوو، جهێ ڤەهاندنێ و ناڤونیشانییە، لێ دەستپێکا مالکا ئێکێ وەك ناڤونیشان هاتیە هەلبژارتن.

# هزرو ئایینی

ئەو چێکەرێ ئەو چێکرین — ڤێت بزانین ئەو کییە
بۆ وی ببین شاکرین — باش بزانن خودێیە ١
چو تشت نابیت وەکی وی — ئەو نە وەکی کەسێ یە
کەس نابیت بەرانبەری وی — کەسێ هێژا وی نییە ٢
بکەن هزرا ل کارێ وی — کا کی دشێت وەکی وی
بەرێ خو بدەنە عەسمانێ وی — چ کارەکێ سپەهی یە ٣
بەرێ خو بدە ئاخا وێ — کا کی هەیە شبێهێ وی
داکێم بکەن شوکرا وی — رێکا وی رونا هەیە ٤
بەرێ خو بدەن روبارا — ڤان چیا و دار و بارا
ئەڤان دەشت و بیابانا — کەسێ ئەڤ فکرە نییە ٥
چەند ئەڤ عالەمە ببن ئێک — زانینا خو بکەن ئێک
نەشێن چێ کەن پەلێ هێکێ — ئەڤە من گوت راستییە ٦
چێکەرە بۆ ساخ و عەریا — وی دانان ئەرد و دەریا
ئەزەرکەن حێشتر و مویریا — کا هێژا کێ وەکی وی یە ٧
بەرێ خو بدە بیچا را — مەخلوقات بابلیا را
نەشێم لێدەم ئەحبا را — کارە هەر کارێ وی یە. ٨

باتیفا ٧/٣/٢٠٠٩.

روباد

٢٣

## ئاینی

بەحەشت گەلەک یا خۆشە    خوزی ئەز چوبا مێ
دوژەخ گەلەک نەخۆشە    خوزی ئەز نەچوبا مێ ١

بەحەشت هچ بەحەشتە    یا تژی هەمی تشتە
جهەکێ سەیران و گەشتە    دێ حاسل کەت مەرامێ ٢

چی تشتێ تو بخوازی    دێ وەرگری ب شانازی
تو تێدا نائێی لەزی    تو دێ بینی نزا مێ ٣

تو دێ بینی سپیە ژێت مەزنا    حەفتێ خەریفا بنە ژن
سوار خلاسێنا کەناچە زڕبیە زنا    چی تشتێ تو بخوازی (سۆوار) تێر تابی ژنا مێ ٤

بەحەشت ب تاعەتێ تێدا کرین    ئێشانە للابچینێ گاڤا د مرین
دڤێت ئەم بو حالێ خو بکرین    دا ئەم نەچین جەهنەمێ ٥

خوزیا وی کەسێ بەحەشتێ کری    ئەوی تەرسا وی ژ ئاگری
ژ لێ کەسێ خو لبەر نا گری    لبەر وی ئاگری وگەرمێ ٦

ڤێت فروش باش خو چێکەن    باشیال ئێش خو فرێکەن
بو باشیا لەرێکەن    دا ژ خودێ نەکەن شەرمێ ٧

ئەڤ دونیایە لەعابە    موسولمانا تازە رێ رابە
کەسێ گوهدارێ حەرابە    فروشما تو لێ فەهمێ ٨

لحێ دنیێ مێهڤانین    نەلازم مالێ باش دانین
باشە ما ئەم نزانین    دا ژ خودێ بخازین رەحمێ ٩

باتیفا ١/٣/٢٠٠٩

روبار

٤٤

# ئایین

هەوارا من تویی یا رسولەللا — ئەز گونەهکارم گەلەک وەللا
ئەزێ کەتیم دەستێ شەیتانی — هیڤی دارم ل من بکە بەرەڤانی
گاڤا ئەز مرم دێ من هاڤێن خەندەقێ — ژ عەیبێ خودێ و ئەنبیە هەوارکێ
ئەز ڤەقیرم تو خەبەر بولبە شەرا — ببە بەرەڤان بوڤێ ئەبتەری
گاڤا ئەز بڕم مەیدانا حەشرێ — من ژ دەستێ مەئمورا بینە دەرێ
دا من نەبەن بئەسەلەسیرێ — ئەز خوّ ناگرم ل بەر زنجیرێ
چنکو ئەز زەعیف و بەلنگازم — ئەز هێڤیێ ژ تە دخازم
من عەمەل پیس و خراب بن — بڤان عەمەلا ئەزێ وندا بن
ئەگەر بو مە نەکی شەفاعەتێ — ئەم دێ بین پیسێت ئوممەتێ
ئەز فەقیر و بێ چارەمە — ئەز هەژارێ ئوممەتا تەمە
تو شافعی بو گونەهکارا — توی هاریکارێ هەژارا
توی پەیغەمبەرێ ساحب رسالەت — نەبی بەرەڤان دێ بین خوسارەت.
ئەز بو دینی بێ رەوا جم — بو ریکێ بێ خەرجوخەرا جم
ژ باشیا ئەرحەرا جم — هیڤی دارم بکە عیلاجم
من ئیمانا ب خودێ هەی — من یەقینە من ژبیر ناکەی
دێ بەرەڤانیێ ژ مە کەی — من ئیمانا بتە ژی هەی
هیڤی دارم ژ رەحمانێ — عەفو خوّ ل سەر مە دانی
تو شافعێ مە هەمیانی — ئازادکە کوریێ تەتەر خانی،

روباد

باتیفا ٦/٧/٢٠٠٨

٧٥

## ژیانا وەلاتێ هەژارا

کول و کوڤانا ئەز کوشتم     ئەز دعاقلێ کوردا نەگەهشتم

وان ئەز دین و هار کرم نەهشتم     بەردام چول و بەیارا ١

ئەز نزانم بوچی خو تێناگەهینن     شەڤ و روژا پەلە پەلە و دوور وینن

ئەڤ شێن ئێک دو تێبگەهینن     خو خلاسکەن ژ بەرشەڤ و دارا ٢

هەر دو وێل بەرشەڤ و دەستا     ئەڤ شێن بلندکەن دەستا

ژیانا وان ل گرتیا ناوخەستا     ئەڤ شێن سەری بلندکەن لبەر نەیارا ٣

ڤێجا چ وا مروڤ نەبوهرێت     کو کورد ئەڤ شێت بلەبڕێت

کول سەر ئاخا خو ئەو بڕێت     هەردەم وی نالە نالە وەک برینداران ٤

ساهەبونا وی کوردی بوچیە     روژا روناهی لوی تاریە

چو کارا ناکەت چی بەجیە     هەرخزمەت کارە بو دوژمن و نەیارا ٥

وەللاهی ئەزمام عەجێب گرتی     ژبەرڤی مللەتی پرت پرتی

وان ئێت چێکرین سەت پارتی     بوچی هوین هەمی نابن برا ٦

دەنگێ خو بکەن ئێک بکەن کاری     داماێ خو ژ دوژمنا بخازی

داملەت ژوە ببیت رازی     دا بەسی بچن ل بەرڤنا را ٧

ساهەتا کەنگی سەرشور بو کرێتی     هوین راوەستاینە وەک گێتی

نێ دوژمنا توێ مێتی     هەی سەرشورێ ل بەر دیوارا ٨

کەنگی مللەتەک سەرکەفتیە تێ خەبات     ئەز نزانم (٥) هندە سالە چەوا خەوا وەهات

ئەڤ کوردستانا پڕ خێر و خرات     وە هێلا بو دوژمن و نەیارا ٩

نێ وە ربا دهار و دین کر     هندی وی نەسیحەت بووە کر

وە پشتا خودانێ وە گوهێ نەکر     وە پیروز بیت ئەڤ ژیانا وەلاتێ هەژارا ١٠

باتیفا ١٣/١/٢٠٠٩

## هەوارە خودێ

هەوارە خودێ تو رەحمانی
رەحمێ بمە ببە بکە ئەزرانی
ئەم فەقیرین تو رەنگینی
هەمی مالا گریە و شینی
یا ئیلاهی تو قادری
تو یێ تەمرنی ڤی ئاگری
تو لناڤ کوردا ئاکەر لێ
بۆ وان خوشکە ئەڤێ دەرلێ
توخالقێ ئەم مەخلوقین
بلا بەسبیت مەراتەقین
تو بۆ خاترا روژا ئینێ
تو نەحەقاڤە بریسنێ
عەزابا وان تو دو طاکە
ڤێ کوشتنێ لناڤ مە راکە
بلا مەسئول باش بزانن
بکە یغاخوێ پێل وادانن
ئەڤ ملله تەگەلەک وەستا
ژغەیری کوشتن و خەستا
وەژبیر کرن ئەنفالێت رەش
ئازادیا مە بۆیە هەش

حالێ مە کوردا باش دزانی
بۆ کوردا پێلی مەسعود بارزانی
ئەڤ شەری تو ڤەمرینی
ئەڤێ جەنگێ ژناڤ هەلسینی
بۆ هەمی کارا توی ما هەری
دا بێینە ژێرا ئێسانێ
خلاسکە ئەڤێ حەرلێ
تو خالقێ مە هەمیانی
مەمو کومە ئەڤرو یەقین
چیاحەسکە ین تو دێ ئێسنی
تو خوشبکە بۆمە ژینێ
عەزابا خولسە روان دانی
تو حەمیمێ سەروان داکە
دژەگەرێ کوردستانی
ئەڤ ملله تە نەگارانن
وان حسابکەن بجەیوانی
چو تشتێ باش نەهاتێ دەستا
بحاڤێت خو تو بێیت ببینی
کانێ شەهیدێ و گولێت گەش
تێینە کوشتن بئەزرانی

خلێڤان ٦/٥/١٩٩٥
زیاد

٢٨

## گه‌میا پارتیێ وی بره‌ پێش

هزار سلاڤ بۆ خودانێ خه‌نجه‌رێ    پارته‌ك وی دانا وه‌ك بێده‌رێ
مه‌ن ناڤێ وی نڤیسی ل ڤێ ده‌فته‌رێ    بۆ دیرۆکا کوردا هه‌تا مه‌حشه‌رێ ١
بناڤێ وی کورد سه‌ربلند هه‌مي    که‌سێ ئه‌و ناڤ نینه‌ ل ڤێ سه‌رده‌مي
پارتا دیموکرات بۆ کوردا گرگه‌مي    یا بارزانی کری که‌سی نه‌ کریه‌ نوکه‌ و نه‌ بهرێ ٢
وی ناڤ مه‌لا مسته‌فا بارزانیه‌    گه‌له‌کێ خوشه‌ ل سه‌ر ئه‌زمانا و سانا هیه‌
پارتا وی مه‌درسه‌یه‌ و ئاڤاهیه‌    وێ کوردستان ڤه‌گرتن وه‌کی که‌مه‌رێ ٣
وی دیروك پڕ کر ژ باشیا    بچانن پیلانێت به‌عسیا
ئه‌و بو ئالا بۆ کوردا هه‌میا    یاد لڤ لڤیت لهێناڤ ده‌ڤه‌رێ ٤
وی سه‌ربرکێشا سه‌ر بره‌کا درێژ    گه‌میا خه‌باتێ وی بره‌ پێش
داکه‌ و ببریت ده‌ستێ پ قرێژ    وی دیموکراتی ئینا ڤێ سه‌رێ ٥
خۆ راگرت وه‌ك چیا ل تنگاڤیا    وی خه‌بات کر بۆ کوردا هه‌میا
سه‌رێ دوژمنا چه‌ماندو چه‌ میا    تا ببه‌ت پیلانا چه‌ ژ ئێرێ ٦
که‌ریم و سه‌لام و عارف سه‌دام    به‌رانبه‌ر وی نه‌ بوون زه‌لام
سه‌دام بۆ خو رتا بۆ خولام    نوکه‌ مه‌سعودێ لوێ کر خو ژ خورێ

ریاد
خلێفان ٢١/٥/١٩٩٥م

٤٩

هەوار خودێ تو رەحمانی
رەحمێ بکە بکە ئەرزانی
ئەم هەژارین تو زەنگینی
هەمی مالا گریە و شینی
یا ئیلاهی تو قادری
تو یا نەمرینی ئاگری
تو ل ناڤ کوردا کەربێ
بو وان خوشکە ئەڤێ دەربێ
تو خالقی ئەم مەخلوقین
بلا بەسبیت مە راتە قین
تو بو خاترا روژا ئینی
تو نەحەقاڤە برینی
عەزابا وان تو دو تاگە
ڤێ کوشتنێ ل ناڤ مە راکە
ئەڤ مللەتە گەلەک وەستا
ژ غەیری کوشتن و خەستا
بلا مەسئول باش بزانن
بکەینا خو پێل وا دانن
واژ بیر کرن ئەنفالێت رەش
ئا ژ دیال مە بویە هەش

حالێ کوردا باش دزانی
بو کوردا پیلە بارزانی
ئەڤی شەری تو ڤەمرینی
ئەڤێ چەنگێ ژ ناڤ هەلینی
بو چ کارا تو ما هەری
مە بینە ژێرا ئیشدسانی
ل ناڤ راکە ئەڤێ حەربێ
تو خالقێ مە هەمیانی
مە مکو مە ئەڤرویە قیلن
چ یا حەسکەی تو دێ ئینی
تو خوشینێ بو مە بینی
عەزابا خو لسەر دانی
تو حەمیمێ سەروان داکە
دابرە ڤێ هەمی بیانی
چو تشتێ باش نەهات دەستا
بچاڤێ خو تو پێت بینی
ئەڤ مللەتە نەگارانن
وان حسابکەن بەحەیوانی
کانێ شەهید ئەو گولێت گەش
تێینە کوشتن بئەرزانی

خلیفان - ٦/٥/١٩٩٥

بهار هاتو یا نێزیکە    هەمی تەیران زیکە زیکە
بۆمە هەمیا خۆزیکە    بلا بهێت سەرچاڤا ١
بلا بهێت خەمرە ڤین    گەلەک خۆشە تێدا ژین
بۆ سەیرانا بەرهەڤین    دا بچین بەرسویلا ڤا ٢
سیبەرا دا رۆبارا    یا خۆشە بۆ دلدارا
جهێ شەهیدو هەژارا    هەرن لێ بکەن سلاڤا ٣
بهارا کوردستانێ    خۆش جهە بۆ ژیانێ
وەرن دا بچین سەیرانێ    ژێ تێتە بێهنا گولاڤا ٤
تە ژێیە ژ هاڤین گەها    جهەکێ خۆشە پڕ بها
هەرن رۆنن لبەر سها    بلا تو بدی دراڤا ٥
حەوجە نینن بەفروجەمەد    ئاڤ تەزبە بێ حەد
خیارا دکەت دۆقەت    جهێ نێچیرو را ڤا ٦
بهار گەلەک پیروزە    یا تێدا جەژنا نەوروزە
بۆ هەمی کوردا دوزە    کوردستان بو یکە شەهیدا ڤا ٧

روباد    ٢٠٠٦/٦/٢٣ باتیفا

٣١

# دیروکا کوردا درێژە

دیروکا کوردا دویرو درێژە — ئالەک پا قرژە ئێک قرێژە
خەباتا وان گەلەک ژ مێژە — ژبەر ئالوزیا مانە ل پاش
کوردا کەسێ خوبکەسێ نەدا — لەوما کەفتن کول و دەرد دا
ئێکێ ل دویڤ ئێکێ بەرنەدا — لەوا هندە مان بێ معاش
بوون دژێ ئێک کەفتن کەلا — ئێک و دوکوشت بوون سوبەلا
دوژمنا گوت یاری کەلا — کەفتن جەنگا سوتن گەش
وان ئێک و دو تالانکرن — دوژمنێت خورازیکرن
وان نەگوت ئەڤە بەرخرابکرن — بو دوژمنا بوون کەدیشی
ترک و فارس و عەرەبا — هوسا بو وەمەزحەبا
دانە ئێسا کورد و عەبا — هەتا بو وان بوون کالەش

ooo

روبار

باتیفا ٢٣/٦/٢٠٠٨

من نەڤێت کوردستانا بێ کەو — ل سپێدا وەکی لێد خوینن ئەو
خەوگرانا رادکەن ژ خەو — بن دەستیێ ڤەبولنا کەنە و
دەنگێ کەوا زور خوشە — گاڤ و دەما وان خورو شە
کوردستان بوان خوشە — گاڤارا بوونا دکەن نە و
دگەل بانگێ سحا رێ — دێ ژلیا هێن حنا رێ
دێ چن شەرا وەک ترپا رێ — دێ بیت شەرو لێکدانوهەو
دێ گەرن ل دورمەسەبا — دێ کەن گازی و قەبقەبا
نامێن ئێک دو مەرحەبا — وەسیفەتێ کوردانەئەو

٤٦ باتیفا ١٧/٧/٢٠٠٦

## شورەشی رابو پیا

یازدەی ئاداری هاتە ڤە    بیرهاتن دگەل خوینا ڤە
بیرهاتنا سالا حەفتێ    مافێ کورد ڤەقەرارکەفتێ
ل حەفتێ و پێنجێ ئەیلولێ    جارەک دی پێشمەرگە بەربوچولێ
حوکمەتا عراقێ خوٚ پێک ئینا    قرارا جەزائیر دەرئینا
قیادا کورد چو ئێرانێ    پێک ئینا شورەشا گولانێ
پشتی مودەهەکێ کورت    شورەشامە بوٚ ڤە جورت
پێشمەرگە کەتە دەشت و چیا    شورەشی رابو سەرپیا
ژ ئەیلولێ شورەشی بو چل و چار سالی    بدەست خوٚ ڤە ئینا فیدرالی
سەحمە راتی خوینا شەهیدا    فیدرالی وەرگرت عەگیدا
مخابن بوٚ شەهیدێت سوباتێ    بچاڤ نەدیت فیدرالی ل ڤاتێ
داوان کر باعزگیسی    وەکی دچونە ئێک بارزانی
زەرڤاوین کوردو نێ    نەهێلا بچیت ئەو ڤرزگینی.

(ئیمزا)
باتیفا - ٣/٣/٢٠٠٦ ز روباد

وەکی مروڤ دچیت بارزان    دل دکەڤیت لەرزان
ل بەر زوریا شەهیدان    ئەو وێت ژێربوین ل ڤەبرستان ١
ئەو شەهیدێت ئەنفالکری    ل گورستانێ ژێن کری
دڤێت مروڤ بکەت گری    ژبەر مخابنیا وان ٢
بارزانە پایتەختێ شەهیدا    جهێ فێرمسی و عەگیدا
شورەشا ئەوێ ژەویدا    ل سەرئاخا کوردستان. ٣

(ئیمزا) روباد    باتیفا - ٣/٣/٢٠٠٦

٣٣

# ئەپیرۆزبیت

ئەپیرۆزبیت سەرۆکاتی شێرێ بارزان — دێب دەستنێ تەهەرغیت پەیمانا لوزان

ئەو بڕیارا کوردستان کری پارچە پارچە — دێ هەلوەشینی بێ خەرج و خەراجە

رابە سەرخو بوەلێ رۆستەمێ زال — وان عەهدو پەیمانا بکە بەتال

ناڤێ هەوە بێ گەریای لهەمی جیهانێ — خاسمە نهۆ تۆی سەرۆکێ کوردستانێ

کورداب فەرمی تۆ کری سەرۆک — بۆ دوژمنانە مان چو دەرۆک

ئێدی کەسی نەشێت تەبچاپێنیت — کات هات کورد مافێ خۆ بستینیت

(١٤٠) تو باش هشیار بە بۆ مادێ سەدو چل — باشتر دبەراهەرە هوش د دل

بەر لەمانێ عراقێ گەلەک بەعسینە — مادێ سەدو چل ب دلێ وان نینە

ئەو خوحابدکەن کو ئەو سیاسینە — بەلێ هیچ رانیلن لدەڤ نینە

بەلکی دژی کوردو فیدرالینە — چەوپاشق و مەعشوقێت سەدامینە

سەرۆک بلائەریکابچت پاشی ببینە — کادێ چەوا رێک و کولان بن خوینە

سەرۆک جارەکا دی هەرە لدەڤ روینە — رەئیا هەمیا بزانە و بستینە

تو دزانی خائینو نوسوخلس کاکینە — هەتا سنورێ کوردا چا شکرا نەکرن نە روینە

دێ مستورا باش ئێب گەهینە — دیرۆکا مللەتێ خۆ بۆ بێژە و ڤەهوینە

دارێت بارزان هەمی تێغە نگن — بەلگێت وان هەمی فیشەنگن

پێشمەرگێت هنگو زۆر چەلەنگن — دێ تولا هەڤەکەن و دێ چەبنگن

ئەز باش پاش عەرەبا د ناسم — ژوەختێ عەبدلکەریم قاسم

ئەوان ئێعداسکرینە پێشمەرگە لەیلا قاسم — وەکی تر کاچە ئێناسەری دیرسم

(signature)
رۆباد
باتیفا - ٣ ٢٧/١/٢٠٠٨ ز

# خوداني خەنجەری

رەحمەتی بیت بارزانیێ پادشا　　خوداني کەڤرو تیرا شا

خوداني خەنجەر و شاشا　　ناڤێ جاشادە پیاسەرجاشا

هەر راخوێ بکەن ل بارزانی　　کاچە واشورشکرو زانی

رێڤەبرو پێسکێ ئانی　　نوکە ژدەرڤە تێین تەماشا

ئەڤرو مەسعودێ لشوینا وي　　ئەوی هەلگرت ئەرکێ وي

پێ خوێ دەینا شوین پێ وي　　ڤەلەمدا نانا جیهتێ رەشاشا

وێدە ڤێت مافێ هەمی دروڤا　　هەمی گوجاخ و هەمی توڤا

ئەوە دژی کەرجو ڤا　　لەوسەرو کاتی لێ وەشا

وەکی دچیت کومبینا　　چی گوتنا باشەوی ئینا

بیرناکەت چوبرنا　　وەرگرت مەدالیا باشا

د بێژیت ئەم عراقینە　　نابەینا چوکەسافەرێ ئینە

لسەر رێکادیموکراتینە　　جوداهی نینە نابەینا عەگال و شا

فەیلی کوردن و شیعەنە　　بەهرا پتر سوننەنە

کەس نابێژن کەس نەنە　　دال بەرخوە راکەین رەشا

رێباد کاخفتنێ تە چێکرینە　　هەمی ژی باکوردینە

تە ژکیرێ کومکرینە　　تەیاکری هەڤالین یادەروێشا.

باتیفا ٥/٦/٢٠٠٦　زوباد

٣٦

کەس دلێ خۆ بدلێ خوشنە کەن		گەلەك ئاعەتێ بۆ خودێ خۆ بکەن
بلا کارێت حەلال هوون بکەن		دا ژێ دەرکەڤن بسەرفەراز ی ١
تو تێدا بمینی هزار سالا		تو ناگەهی جوهرا دو خالا
تو دێ مری ژێ دەرکەڤی ڤالا		تو خودێ خۆ ژ خۆ بکە رازی ٢
خۆ دویر بکەن ژ وەسوەسێ		گوهنەدەنە ڤێ دنیێ ئاسێ
باش خودێ خو ڤێت بناسێ		ل پێشی هەمیا هەیە دادگەهو ترازی ٣
چیامەکری یا بحسابە		خۆ دویر بکەن ژ کارێت خرابە
قیامەت یا بترسە بێ ئێشابە		دگورێدە مەلەك دێل مەکەن گازی ٤
مانامە لدونیائێ بۆ کێم تیجانە		نەبەسی بۆ خارن وڤەخارنا نە
کادێ بین کافر یان خودان ئیمانە		ببە خودان ئیمان دانەئاسزی ٥
یارەب تو مە بگێری ژ ڤە نجو باشا		تو مە نەکەی ژ مەبلە ترا شا
تو بدەی مە سیبەرا عەرشا		شەیتانی ژ مە ڤەکەی ئەوی بەرازی ٦
شەڤ و روژوی کارفەسادە		دگەل موسولما ئاخودان عنادە
ئەم هیڤی دارین ویژ مەلادە		داسەرکەڤین لڤی ئەڤرازی ٧
مەدەر باز بکە ژ پراسیراتێ		ل سەرا بچین وەکی میقاتێ
ل مە دویرکە گاڤاهەی هاتێ		ترازیائەیە باشتر ترازی ٨
ئەڤەرا دی هیڤی ژتە کرن		گەلەك داخاز ویژتە کرن
هیڤی دارەجەللاوەر گرن		شەیتانی ژێ دویرکە ئەوی جەنبازی ٩

بانیفا - ٢٣/٣/٢٠٠٩

کوباد

٢٦/

## ئەڤینی – دەلالاوەکێ قەمەرێ

وەرە نێزیکێ دلبەرێ ئەی دەلالاوەکێ قەمەرێ
یاڤێ پشتێ کەمەرێ تە جان جەدرا جکرن ئەسمەرێ 1
ئەڤ خەلکە تە دینوهار کر دلێ پیرو جەحێلا بریندار کر
ڤیا ناتەل هەمیا کار کر تو زور بخود بەی ئێفتخارێ 2
هەروەل بەری بەیانێ چەند دەرمانو کێل دوکانێ
تو دێل چاڤا دەی جانێ هندا ڤارێ لبەر پەنجەرێ 3
ئەرێ ما تو ژ خودێ ناترسی خودانا پرچا ئەلماسی
تە بکە ڤن وان چاڤا داسی تە لەمە تالانکر جانیا بهارێ 4
تو ژ بهارێ جوانتری کەسەک تو دیتی دێ تەحەری
دێ خازیت تو بکەهی وی هێژا زوری تە ئەڤ خەلکە ڤێرکر ساحرێ 5
خو ڤەشێرە دلبەرێ تە ئەم سەردا برین فتنەکەرێ
تو شرین تری ژ شەکەرێ چی گاڤا دینا بوم تو ئەگەرێ 6
تە خەلکێ کوشتی بێ چەکێ رەحمەکێ بکە بچەلکێ
من ژی یا هەی جەتەکێ بەلکی ببرین پێکڤە مەهرێ 7

باتیفا ٢/٣/٢٠٠٨

ع
کروباد

# کورد ئێدی ناهێلن خاپاندن

کوردستان دل ڤەکەرە
بۆ ژیانێ وەک شەکەرە
من ڤەبۆل بۆ دەربەدەری
دابکەم بوریک دابچم سەری
دلبەرەکا شوخ وشەنگە
ئەپارا بۆ نەهێلا رەنگە
عەلی یە قوتابێ خەباتێ
وی ژێبیا زا وایا زاتێ
یاسەداحی دگەل کوردا کری
بۆ هەردو کامان کول وگری
کورد ئێدی ناهێلن خاپاندن
ئابەردەن کوردستانێ ئاڤردن
بارزانی رێکا نویشاندای
دوژمن دێ کەن ئایو وای

بۆ جانێ خوش دلبەرە
ل سەر رویێ بوم دەربدەر
دێ بچم ژێرە ڤان لبەردەری
بلا روحا من بێتە دەر
ئەو گەلەکا بناڤ ودەنگە
عەرەب وترکێت دل کەسەر
بێ نالبەندیو بارزانێ
بۆچو دوژمنان نەمایە مەفەر
نەکێم ترب ویا هێت لەری کری
کوردا راکر ئالایێ زەر
ل سەرلحەبائێ ئەوتوشندن
بلا سەدجارا ببن دەربدەر
دێ هەرمینن ئەلا دای
کوردێ وان کەتە دەر.

باتیفا ١/٣١/٧ ٢٠٠٩

ع
زکوباد

٣١

# ناڤەرۆك

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكولینێن كوردى

